# شەرحی رەحەبی
# لەعیلمی (فرائض) دا بەکوردی

وەرگێرانی:
عمر شێخ نورەدین مفتی



چاپی یەکەم

1430 2009

# شەرحی رەحەبی
# لەعیلمی(فرائض)دا بەکوردی

وەرگێڕانی:

عمر شێخ نورەدین مفتی

**چاپی یەکەم**

١٤٣٠ ٢٠٠٩

## لەبڵاوكراوەكانی كتێبخانەی هەژار موكریانی


ناوی كتێب شەرحی رەحەبی لەعیلمی( فرائضدا) بەكورد

- وەرگێرانی عمر شێخ نورەدین مفتی
- دیزاین: كامل محمد
- شوێنی چاپ: چوارچرا
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەكەم ٢٠٠٩
- ژمارەی سپاردن ١٤٨٦_ساڵی ٢٠٠٩
- نرخی ٤٠٠٠ دینارە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه وأعوانه وأولياء الله أجمعين

خوێنــەریَ بــەڕێز : ماوەیــەکی زۆرە کەوتبوویــە خــەیاڵم کــە لــەعیلمی (فـرائض) دا شـتێك بنوسـم کـە سـوود بـەخش بێـت ، بـە تايبـەت لـە دوای ئـەوەی لـە وەرگێڕانـی کتێبـی ( فـتح القريـب ) بوومـەوە پـشت بـە خـودای گەورە سەرکەوتوو بووم لە (فرائض) ەکەیدا .

وە شــەش جـار زيـاتر لـە سـەر يـەك ئـەم کتێبــی (شـرح الرحبيــة) م وتووەتەوە بە قوناغی شەشەمی دواناوەندی خوێنـدنگای ئاينی وەزارەتـی ئەوقاف .

وە دوو هۆی تر کاریگەر بوو بۆ ئەوەی هەستم بە نوسینی :

یەکەم : فەرموودەکەی پێغەمبـەر (ﷺ) کـە دەفـەمویَ (( تعلمـوا الفـرائض وعلّموه الناس فإنه نصف العلم وهو ينسى وهو أول علم يُنزع من أمتي )) .

دووەم : لە زۆر شوێنا پرسیاری میرات بێتە پێشەوە زۆر لە مامۆستايان نارۆنە پێشەوە بۆ وەڵام دانەوەی ، بە تايبـەت لـە جيلـی تـازەی ئـەمڕۆ کـە دەگمەنـە يـەکێك بتـوانیَ مەسئەلەيك لـە عيلمـی فرائض وەڵام بداتـەوە ، بـەڵام ئەگەر لە بارەی وەڵامی دونيايی بێت چاك وەڵام دەداتەوە .

کتێبی (شرح الرحبية)م بە چاك زانی لە هەندیَ رووەوە بۆيە هەستام بەم شێوەيە وەرمگێڕايە سەر زمانی کوردی ، هۆنراوەکان يەك يەك نوسیمەوە و وەرگێڕانەکەشـی لـە لايـا لـە پاشـا شـەرحی رەحبییەکـەم تەرجەمـە کـرد بـە مەسـئەلەکانەوە بــە شــێوەيەکی تــازە ،وە لــە هەنــدیَ شــوێن و جێگــادا تـەرجومەم نەکردووە و وەڵامی پرسـیارەکانیم نەداوەتـەوە لـە بـەر ئـەوەی بـە پێويستم نەزانیوە .

وه ئەو كتێبانەی كە پشتم پێ بەستووە

(١) الـدرة البهيـة بتحقيـق مباحـث الرحبيـة   محمـد محـي الـدين عبدالحميد

(٢) مغني المحتاج

(٣) إعانة الطالبين

(٤) حكم الميراث في الشريعة الإسلامية

(٥) حاشية الباجوری

(٦) الفقه المنهجي

(٧) أحكام الأسرة في الفقه الإسلامي

(٨) فقه المواريث

وه هەموو مەسئەلەكان بە شێوەیەكی گشتی لێكداوەتەوە ، بە هیوای ئەوەی كە خوێنەواران سوودی لێ وەربگرن ،ببێت بە توێشوی رۆژی دایی آمین ، وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين

عمر شێخ نورالدين مفتی

هەڵەبجەی شەهید

مزگەوتی دارالسلام

سێ شەممە

١٩٩٩/٨/١٠

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي له ميرات السموات والأرض ، والصلاة والسلام على سيدنا محمد الذي ورث العلم و لم يورث دينارا ولا درهما وعلى آله وأصحابه أجمعين .

وەکو زانراوە مەسەلەی تەماع زۆر کێشەی دروست کردووە وە ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش بۆ هەموو کێشە و ئاژاوەیە چارەسەری گونجاوی بۆ داناوە وە مەسەلەی میراتیش ماڵ و سامانێکە لە مردووە بە جێ دەمێنێ ئەگەر بە عادیلانە دابەش نەکرێ ئەبێتە هۆی ناکۆکی و ئاژاوە .

نابینی هێشتا دادە باوکی نەمردووە دەڵێت دەبێت بە قەدەر براکەم ببەم و رازیم نییە زیادی بدرێتێ ، کەواتە زۆر کەس چاویان بڕیوەتە ئەو ماڵەی کە لە مردووەکە بە جێ ماوە .

جا بۆ ئەوەی کەس دڵی لە خۆی دانەمێنێ قورئان بەشی هەموو کەس و میراتگرێکی مردووەکەی دیاری کردووە بە شێوەیەکی زۆر وورد و عادیلانە ئەویش ناسراوە بە عیلمی فرائض و میرات .

زانایان لە مێژەوە لە سەریان نوسیوە بەو پێیەی لە قورئان و حەدیث وەریان گرتووە و ئاسانیان کردووە ، وە بە زمانی کوردی خۆشمان نوسراوەتەوە .

وە لەو کتێبانە کە لە عیلمی فرائض دا نوسیویەتی بە عەربی و بە شیعر کتێبی (رحبیە) کە مامۆستا شێخ عمر کردووەیەتی بە کوردی ، خودا جەزای بە چاکتر بداتەوە کتێبێکی زۆر بە سوودە بە تایبەتی بۆ کەسانێ ئەیانەوێ لەومەسەلانەدا وەلامی پرسیاری خەڵك بدەنەوە .

ئەم وەرگێرانەی مامۆستا شێخ عمرە یارمەتی دەرێکی گەورەیە و سوود بەخش دەبێت هەرچەندە هەموو مەسائیلەکانی گرنگن هەر لە دیاری کردنی فەرزەکان و خاوەن فەرز و عەصەبە و حەجب تا موناسەخات و مفقود .

بەڵام لایەنێکی زۆر گرنگی تێدایە کە لە کتێبەکانی تردا ئا بەو شێوەیە بە ئاسانی باس نەکراوە ئەویش دابەش کردنی ئەندازە ماڵە میراتیەکەیە کە ئەو مەبلەغە پارە تقسیم ئەکرێ بە سەر ئەصڵی مەئەلەکەدا یان ئەو ژمارەی لێی دروست دەبێت ئەنجامی دابەش کردنەکە چەند بوو زەربی سەهمی هەریەك لە میرات گرانی ئەکەی .

وە چەند بابەتی تریش ئومێد دەکەم سوود بخش بێت و ئەگەر تێبینییەکی تیابە دی بکرێ لە لایەن زمان و وەرگێڕاندنەوە ئەوە زیانی بە عیلمەکە نەگەیاندووە وە هەر کەس مەبەستی عیلمەکە بێ زۆر سوودی لێ وەردەگرێ ان شاء الله .

سيد غفور أحمد

امام جومعەی بیارەی شەریف

بسم الله الرحمن الرحيم

شێخ محمەدی کوڕی محمەدی سبطی ماردینی (رحمة الله عليه )دەفەرموێ :

**الحمد لله رب العالمين والعاقبة للمتقين والصلاة والسلام على سيدنا محمد سيد المرسلين وعلى آله وصحبه أجمعين .**

له دوای ئەمانە ئەمە شەرحێکی ناسکی کورتە لە سەر پێشەکییەك کە ناوبراوە بە (رحبیە)گەر خودای گەورە مەیلی لێ بێت سوودبەخش دەبێت.

ئیمام ئەبی عبدالله محمەدی کوری علی کوڕی حوسینی رەحەبی دەفەرموێ :

**أوّلُ ما نَسْتَفْتِحُ المَقالا بِذكْرِ حَمد ربنا تعالى**

سەرەتایی هەموو فەرموودەیەیە باسی سوپاسی خودامان دەست پێ دەکەین :

**فالحمد لله على ما أنعمنا حمدا به يجلو عن القلبُ العمى**

سوپاس بۆ خودا لە سەر نازونیعمەتەکانی – خودا بە هۆی ئەو سوپاسەوە لای ببا کوێری لە دڵدا

**ثم الصلاةُ بعدُ والسلامُ على نبيٍ دينُهُ الإسلام**

پاشان سەلات و سەلام لە سەر حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) بێت کە ئاینەکەی ئیسلامە .

**محمد خاتمِ رُسل ربه وآله منْ بَعْده وصَحْبه**

ئەو (پێغەمبەرە محمد) ە (ﷺ) کۆتایی هەێنەری پێغەمبەرانی خودایە (ﷺ) سەلات و سەلامیش لە سەر ئال و بەیت و هاورێکانی لە دوای خۆی .

**ونَسْـــألُ الله لنا الإعانة فيما توخينـــا من الإبانة**

لە خودا داوای کۆمەکی دەکەین – لەوەی نیازمان کردووە لە ئاشکرا کردنی .

عن مذهبِ الإمامِ زيدِ الفرضي    إذْ كانَ ذاكَ من أهمِّ الغرضِ

له مەزهەب و ڕێگای ئیمام (زەید) کە زانایە بە عیلمی (فرائض) — ئەم نیاز و ئاشکراکردنە لە گرنگ ترین نیازە – بۆ کەسێ کە بیەوێ شارەزا بێت لە عیلمی (فرایض ) .

زەیدی کوری ثابت یەکێك بووە لە هاوڕێکانی پێغەمبەر (ﷺ) وە لە زانا بەرزەکان بووە وەزۆر زانابووە بە زانستی (فرائض) ، ئەو ڕۆژە کە کۆچی دوای کردووە حەزرەتی عومەر فەرموویەتی (( ئەمڕۆ زانای مەدینە وەفاتی کرد )) وە دەیفەرمووی هەرکەس زانیاری لە بارەی (فرائض) ەوە هەیە با بڕوات بۆ لای زەید .

علماً بأنَّ العلمَ خيرُ ما سعي    فيهِ ، وأولى مالَهُ العبدُ دُعي

لە بەر زانیاریمان بێ گومان زانیاری چاکترین و شیاوترین شتێکە هەوڵ و کۆششی تێدا بدرێ و بەندەی بۆ بانگ بکرێت .

وأنَّ هذا العلمَ مخصوصٌ بِما    قدْ شاعَ فيهِ عندَ كلِّ العلما

بێ گومان زانیاری ئەم زانستە تایبەت کراوە بەوەی بڵاوبووەتەوە لە ناو هەموو زاناکاندا .

بأنَّهُ أوّلُ علمٍ يُفْقَدُ    في الأرضِ حتَّى لا يكادُ يُوجَدُ

بەراستی یەکەم زانیارییە لە زەویدا نامێنێ ، هەتا نزیکە دەست نەکەوێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ ((تعلموا الفرائض وعلّموه الناس فإنه نصف العلم وهو ينسى وهو أول علم ينزع من أمتي )) . رواه البيهقي من سننه .

واتە : زانستی (فرائض) فێر بن وەخەڵکیش فێر بکەن بێ گومان نیوەی زانیارییە وە زۆر زوویش لە یاد دەچێتەوە وە یەکەم زانیارییە لە ئوممەتدا هەڵدەگیرێ و نامێنێ .

**و أنَّ زيداً خُصَّ لا محالَهْ     بما حباهُ خاتمُ الرِّسالةْ**

لە زانیاری ئێمە بێ گومان لە ناو هاورێکانی پێغەمبەردا (ﷺ) وە حەزرەتی زەیدیش تایبەت بووە - بەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو زانیارییەی پێ بەخشیوە .

**منْ قوله في فضله مُنَبِّها     (( أفْرَضُكُمْ زيدٌ )) وناهيك بها**

لە فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) لە بارەی گەورەیی (زید) خەڵکی لێ ئاگادار کردووەتەوە - کە زاناترین کەس بە زانستی (فرائض) زەیدە ، بەسە ئەم شایەتیدانە .

**فكانَ أولى بإتّباعِ التابعي     لا سيّما وقدْ نحاه الشافعي**

زەید کوری ثابت شیاوترە بەوەی شوێن کەوتوان شوێنی بکەون - بەراستی ئیمامی شافیعی (رحمه الله علیه) موافەقەی زەیدی کردووە .

**فهاكَ فيه القولَ عن إيجازِ     مُبرّأً عن وصْمَةِ الألغاز**

ئەم فەرموودەیە لە زانیاری (فرائض) دا وەربگرە فەرموودەیەکی کەمی روونی زۆر مانای دوور لە تەنگی پەر لەلا و پەنهان .

ئەم چەند هۆنراوەیەم تەواو کرد رۆژی چوار شەممە کە سەعات ٢/٥٠ دوای نیوەڕۆ کە ئەو کاتەیە خۆر گیرا بە تەواوی کە بەراستی نیشانەیەکی گەورە بوو لە دەسەلاتی خودا کە پیشانی داین ١٩٩٩/٨/١١ زاینی ، خودا رەحم و بەزەیی و میهرەبانی بجوڵێ بەرامبەرمان .... آمین .

## هۆكاری میرات [1]

**هۆكارەكان لە زمانی عەرەبیدا :**

ئـەو شـتەیە بـە هۆیـەوە بگـات بـە شـتی تـر وەك خزمایـەتی ئیناسـان دەگەیەنێت بە میرات ، وە لە زاراوەی زاناكاندا : ئەو شتەیە كە بە پێویست بگەیـەنیٚ لـە بـوونی خۆیـەوە بـوون وە لـە نـەبوونی خۆیـەوە نـەبوون وەك خزمایەتی (قرابة) هۆیە بۆ میرات بردن .

أسـبابُ میراث الـوَرَى ثلاثة　　كلٌ یُفیـــدُ ربَّهُ الـــوِراثة

وهـيَ : نكَاحٌ ، وَوَلاءٌ ، ونسب　　ما بعدهنَّ للمواریث سبَـــب

هۆكارەكانی میرات بردنی ئادەمیزاد سیانە – هەموو یەكێك لەو هۆكارانـە سـوود دەگەیـەنیٚ بـە خاوەنەكەی لـە رووی میراتـەوە ئەوانـەش بـریتین لـە : نیكاح ، ولاء ، نەسەب .

---

(١) : (فرائض) میراث لە زمانی عەرەبیدا بە واتای : دانان هـاتووە . وە لـە شـەعدا بـە شتێكی دیاری كراو لە رووی شەرعەوە بۆ میرات بەر

میرات هەر جۆریٚ بیٚ ئادەمیزاد لە پاش مردنی پێنج (٥) حەق ڕوی تیٚ دەكات وە لـە سەر ئەم رایەن زانایانی حەنەفی وشافیعی و مالیكی .

جیٚ بەجیٚ كردنی ئەم حەقانە بەم شێوەیە :

یەكەم : ئەو مافانەی كە بەسراوە بە عەینی میراتەكەوە .

دووەم : بەڕێخـستنی مردووەكـە لـە كفـن و بۆنخۆشـی و كرێـی شـۆردنی و گـۆڕ هەڵكەندنی و شتی تر بە بیٚ رژدی و زیادە رەوی .

سێهەم : ئەو قەرزانەی كە بە سەر ئەو كەسەوەن كە مردووە .

چوارەم : جیٚ بە جیٚ كردنی وەسیەتەكانی لە سیٚ یەكی ئەوەی ماوەتـەوە لـە دوای قەرزەكان .

پێنجەم :پاشان ئەوەی مایەوە دابەش دەكرێت لە میرات بـەرەكان ، مغني المحتاج ٣/٣-٤ ، والدرة البهیة ص١٠ ، شەریعەتی ئیسلام ٣/٣٣ .

لە دوای ئەمانە هۆ نییە بۆ میرات وەرگرتن هۆکاری میرات وەرگرتن ئەوەی زاناکان لە سەری کۆن سیانە مادام شتێك نەبێ بە هۆی قەدەغە کردنی [1].

یەکەم : (نکاح) : ژن و مێردی ، واتە : گرێ بەستی نیکاحی ژن و میردایەتی دروست بە هۆی ئەم نیکاحەوە مێرد و ژن و ژنەکان میرات دەبەن لە یەکتری .

دووەم : (ولاء)ە واتە : ئەو حەقەی کە بە هۆی ئازادکردنی بەندەوە پەیدا بدەبێت بۆ خاوەنەکەی کە ئازادی کردووە ، ولاء : میرات وەردەگرێت ئازاد کار نێر بێ یان مێ وە عەصەبەی ئازادکار بە خۆیان [2].

---

(١) : بەلام لە کتیبی (مغني المحتاج) ج/١٤ دا هۆکارەکانی میرات بردن چوارە :

یەکەم: ((قرابە)) خزمایەتی . دووەم : ((نکاح)) نیکاحی دروست . سێهەم : ((ولاء) ئازاد کردنی بەندە . چوارەم : ((الإسلام)) واتە : میرات گر و میرات لێ گیراو موسلمان بن .

لە کتێبی (إعانة الطالبين) دا ٢٢٣/٣ دا دەفەرموێ : خەلکی لە میرات وەرگرتن و وەرنەگرتندا لە سەر چوار بەشە :

بەشی یەکەم : میرات دەبات و میراتی لێ وەردەگیرێ ، ئەمە زۆرە وەك ژن و مێرد .

بەشی دووەم : میرات دەبەن و میراتیان لێ وەرناگیرێ ، وەك پێغەمبەران ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ (( نحن معاشر الأنبياء نرث ولا نورث ما تركناه صدقة )) واتە : ئێمە کۆمەلی پێغەمبەرانین میرات دەبەین وە میراتمان لێ نابرێت ئەوەی بە جێی دەهێلین خێرە .

بەشی سێهەم : میراتی لێ دەبرێ وە میرات وەرناگرێ بەندەی ((مبعض)) .

بەشی چوارەم : نە میرات دەبا و نە میراتی لێ وەردەگیرێ وەکو بەندە و هەلگەراوە لە ئیسلام .

(٢) : ئازادکار بە چەند مەرجێك میرات وەردەگرێت لە ئازاد کراوەکە نێر بێت یا خود مێ بێت :

سێهەم : (النسب) یا( القرابة) واتە : خزمایەتی بە هۆی خزمایەتی یەوە باوك و دایك و ئەوە بە دوایانا بێت میرات دەبەن وە ئەو ئەولاد و ئەوەش بە دوای ئەواندا بێن میرات دەبەن .

---

مەرجی یەکەم : ئازاد کار و ئازادکراو دەبێت هەردووکیان موسڵمان بن .

مەرجی دووەم : میراتگری تەواوی نەبێ بە تەواوی سامانی ئازادکراو .

مەرجی سێهەم : مافێکی وانەبێ کە بۆ بردنی سامانی ئازادکراو بگرێتەوە وەکو قەرز یان خوێن .

تێبینی : هەموو میراتگرێ لە ئازادکار دەبێ بە میرات گری ئازاد کراو لە پاش خۆی جگە کچی و خوشکی ئازادکراو نەبێ هەرچەندە برایش لە گەڵیان بێت ، مغنی المحتاج ٣/٢٠ .

# موانع الإرث

## بەربەستەکانی میرات

ويَمْنَعُ الشّخْصُ مِنَ المِيراثِ　　واحـــدةٌ مـــنْ عـلل ثــلاث
رقٌ ، وقتلٌ ، واختلافُ دين　　فافهمْ فليسَ الشَّكُ كاليَقين

ئادەمیزاد بەربەست دەکا لە میرات – یەکێك لەو سێ هۆیـە : ( بەندایـەتی ، و کوشتن ، و جیاوازی دین ) تێ بگە گومان وەك یەقین نیە[1] .

ئادەمیزادی میرات بەر بەربەست دەکرێ لـە میرات لـە دوای هاتنـە جـێ ی یەکێك لەم سێ هۆیە :

یەکـەم : بەنـدە ( عبـد) بـە هـەموو جۆرەکانییـەوە مـیرات وەرناگرێـت ، وە بەندە پێنج جۆی هەیە :

(١) بەندەی تەواو کە ناوی دەبرێ بە (قن) .

(٢) مُـــدبر ) واتـــە : ئـــەو بەندەیـــە گەورەکـــەی (ســـید) ئـــازادکردنی بەستبێتەوە بە مردنی خۆی .

(٣) (مکاتب) واتە : ئەو بەندەیە گەورەکەی گرێبەندی لە گەڵ کردبێ کە ئەندازەیە ماڵی بۆ بهێنی ئازاد بێت .

---

(١) : بەلاّم لە کتێبی (مغنی المحتـاج)دا ٣/٢٥ دا : دەفـەرموێ : ئادەمیزاد بەربەست دەکا لە میرات یەکێك لەم پێنج هۆیە :

یەکەم : جیاوازی دین .

دووەم : هەڵگەڕانەوە لە دین .

سێهەم : بەندایەتی .

چوارەم : کوشتن .

پێنجەم : نادیاری کـاتی مـردن وەك ئـەوەی دوو مـیرات بـەر بـە یەکـەوە بمـرن بـە هـۆی سوتان یان روخانی خانوو یا لە ولاّتی غەریبیدا نەزانرێ کامیان لە پێشەوە مردوون .

(٤) (مُبعض) واته : ئەو بەندەیە کە هەندێکی ئازاد بێ و ئەوی تر بەندە بێت .

(٥) (أم الولد ) واته : ئەو کەنیزەیە گەورەکەی ڕۆشتبێتە لای بە موڵکایەتی منداڵی لێ بووبێ .

دووەم : کوشتن : میرات وەرناگرێ بکوژ لە کوژراوی خۆی یەکسانە کوشتبێتی بە دەست ئەنقەست یان بە هەڵە یان بە حەق یان بە ناحەق یا حوکمی دا بێت بە کوشتنی یان شایەتی بدا لە سەری ببێت بە هۆی کوشتنی ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموی : (( لیس للقاتل من ترکة المقتول شيء ))[1] واته : لە میراتی کوژراو هیچ شتێك نییە بۆ بکوژ .

سێهەم : جیاوازی دین بەهۆی ئیسلام و کوفرەوە موسڵمان میرات نابا لە کافر وەکافریش میرات نابا لە موسڵمان وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : (( لا یرث ا لمسلم ا لکافر ولا الکافر المسلم)) [2] ، واته : موسڵمان میرات نابا لە کافر وەکافریش میرات نابا لە موسڵمان .

بەڵام میرات دەبەن هەندێ کافر لەهەندێکی ترلەبەر ئەوەی کوفر یەك میللەتن لەمیرات وەرگرتن .

---

(١) : صححه إبن عبدالبر وغيره .

(٢) : رواه ا لبخاری ومسلم .

# باب ا لوارثين من ا لرجال

## ميرات بەران لە پياواندا

وَالوارثونَ من الرجالِ عَشَرَة          أسْمائهمْ معرفة مُشْتَهِرَة

ميرات بەران لە پياواندادەيە          ناوەكانيان زانراووبەناوبانگە

ا لابنُ وابنُ الابنِ مَهْما نَزَلا          والابُ والجدُ لَهُ وان عَلا

كوڕوكوڕەزاهەرچەندە بەرەو خوار بڕوا – باوك وباوكى باوك هەرچەندە بەرەوژوورتريش بڕوا

والاخُ من اي الجهاتِ كانا          قَدْ أنْزَلَ ا للهُ بِه القرآنا

برا لە هەر ڕوويەكەوەبىٚ – بەڕاستى خوا قورئانى ناردوەتەخوارە وەبەميرات بردنى ئەوانە بە گشتى

وَابنُ ا لاخَ ا لمُدلى اليه بالابِ          فَاسْمَعْ مَقالا لَيْسَ بالمكذّبِ

برازا يەكەنيسبەت بدرىٚ بوٚلاى باوك   بيبيسە فەرمودەى ڕاست كەدروٚى تيانيە.

وَالعَمُّ وابنُ العَمِّ من ابيه          فاشْكُرْ لذي الايجاز و التنبيه

مام وكوڕى مام لە لايەنى باوكى مردووەكەوە   سوپاسى خاوەنى كورتەو ئاگاداربكە لەباسى ناوى ميرات بەرانا .

والزوجُ ، والمعتقُ ذوالولاءِ          فجملةُ الذكورُ  هؤلاءِ

مێردى ژن ، وئازادكارى خاوەنى نيعمەت   كوٚمەڵى ئەونێرنيانەى كەميرات وەرگرن ئەمانەبوون .

ئەوكەسانەى كەبە ئيجماع ميرات وەردەگرن لە نێرينەدا دەكەسن :

كوڕ ،كوڕەزاهەرچەنديش بەرەو خوار بڕوا، باوك ، باوكى باوك هەرچەنديش بەرەو ژوور تريش بڕوا ، برايەكسانە براى باوك ودايكى بىٚ يابراى باوكى يابراى دايكى ، بەڕاستى قورئان هاتووە خوارەوەبەميرات

بردنی ئەمانە بەگشتی با جیاواز بێ ئەو ئەند ازەی وەری دەگرن ،کوڕی برای باوك ودایکی یا کوڕی برای باوکی ،مام لە لایەن باوکی مردووە کەوە ، کوڕی مامی باوکی بێ یا باوك ودایکی ، مێردی ژن ، ئازادکاری خاوەن نازو نیعمەت .

ئەمە بەکورتی بوو هە ڵژماردنەکەی میرات بەرانی نێرینە ، بەڵام بە دریژی ئەو کەسانەی کە بە ئیجماعی زانایان میرات وەردەگرن لە پیاوان پانزە (١٥) کەسن کە ئەمانەن :

(١) : کوڕ .

(٢) : کوڕەزا هەر چەندیش بەرەو خوار بڕوا .

(٣): باوك .

(٤) : باوکی باوك هەرچەند بەرەو ژوورتریش بڕوا .

(٥) : برای باوك ودایکی .

(٦) : برای باوکی .

(٧): برای دایکی .

(٨) : کوڕی برای باوکی ودایکی .

(٩) : کوڕی برای باوکی .

(١٠) : مامی باوکی ودایکی .

(١١) : مامی باوکی .

(١٢) : کوڕی مامی باوك ودایك .

(١٣) : کوڕی مامی باوکی .

(١٤) : مێردی ژن .

(١٥) : ئازادکاری خاوەن نیعمەت .

# الوارثات

## میرات بەران لە ژنان

والوارثاتُ من النساءِ سَبْع          لمْ يعط أنثى غيرهنَ الشرع

لە ژنانا میرات بەران حەوتن – شەرع بەشی نەداوە لە مێینە جگە لەوان

بنتٌ ، وبنت إبنٍ ، وأمُ مشفقة     وزوجةٌ ، وجدةٌ ، ومعتقةٌ

کچ ، کچی کوڕ ، دایکی بە سۆز – ژن ، نەنك ، ئازادکار

والأخـــتُ من أي الجهـاتِ كانتْ          فهذه عدتهنَّ بانتْ

خوشك لە هەر روویەکەوە بێت – ئاشکرا بوو ئەمە ژمارەیانە

ئەو کەسانەش کە بە ئیجماع میرات وەردەگرن لە ژناندا بە کورتی حەوت کەسن :

(١) کچ .

(٢) کچی کوڕ باوەکو بەرەو خواریش بڕوات .

(٣) دایك .

(٤) ژن .

(٥) نەنك .

(٦) خوشك .

(٧) ئەو خاوەنەی کە بەندەکەی ئازاد کردووە خاوەنەکە ژن بێت .

بەڵام بە درێژی دەکەسن :

(١) کچ .

(٢) کچی کوڕ باوەکو بەرەو خواریش بڕوات .

(٣) دایك .

(٤)دایکی دایك .

**(٥) دایکی باوك .**

**(٦) ئەو خاوەنەی کە بەندەکەی ئازاد کردووە خاوەنەکە** ژن بێت .

**(٧) خوشکی باوکی و دایکی .**

**(٨) خوشکی باوکی .**

**(٩) خوشکی دایکی .**

(١٠) ژن .

## أمثلة ذكر حلها وتعليلها

### چەند نمونەیەك باسكرابێ راهێنان و هۆكارەكانی

(١) پیاویك مردووه كوڕێك یان كوڕی كوڕێكی هەبە وە جگە لەو كوڕە میرات بەری نیە كوڕەكە یا كوڕی كوڕەكە عەصەبەی تەنهان موستەحەقی میراتەكەیە و خاوەنی هەموویەتی .

(٢) پیاوێك مردووه سێ برای باوك و دایكی هەیە وە جگە لەم سیانە میرات بەری نییە : ئەو سێ برایە عەصەبەن و لەیەك پلەدان ، ماڵەكە دابەش دەكرێ لە نێوانیانا بەشی بەشەوە هەموو یەكێكیان ($\frac{١}{٣}$) سێ یەكی ماڵەكەیان دەكەوێت بە بێ جیاوازی .

(٣) پیاوێك مردووه ژنێك و دایكی و كوڕێك یا كوڕی كوڕی هەیە :

| ژن | دایك | كور | مسئلة |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٨}$ | $\frac{١}{٦}$ | ماوە | ٢٤ |
| ٣ | ٤ | ١٧ | |

-ژنەكەی هەشت یەكی $\frac{١}{٨}$ ماڵەكەی دەكەوێت واتە : سێبەشی دەكەوێت لە هەموو ٢٤ بەشێك لەو ماڵە .

-دایكی شەش یەكی $\frac{١}{٦}$ دەكەوێت واتە : چوار بەشی دەكەوێت لە هەموو ٢٤ بەشێك لەو ماڵە .

- كوڕەكە ئەوەی كە لە دوای ژن و دایكەكە ماوەتەوە وەری دەگرێت واتە ١٧ بەش وەردەگرێت لە هەموو ٢٤ بەشێك لەو ماڵە .

(٤) پیاوێك مردووه : ژنێك ،دایكی ،برایەكی دایكی ،دوومامی باوك و دایكی هەیە :

| ژن | دایك | برای دایكی | دوو مام | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٤}$ | $\frac{١}{٣}$ | $\frac{١}{٦}$ | ماوە | ١٢×٢ |
| | | | | ٢٤ |
| ٣×٢ | ٤×٢ | ٢×٢ | ٣×٢ | |
| ٦ | ٨ | ٤ | ٦ | |

ژن و براو دایکی لە خاوەن بەشەکانن ، وە دوو مامەکەی لە عە صبەی ڕشتە یین ژنەکە چوار یەکی $\frac{1}{4}$ دەکەویٚ ودایکی سیٚ یەکی $\frac{1}{3}$ ی دەکەویٚ چونکە نەفەرعی میراتگر هەیە نەژمارەیە لە خوشك وبرای مردووەکەش .

وەبرای دایکیەکەی ($\frac{1}{6}$) شەش یەکی دەکەویٚ وە دوو مامەکەش هاوبەشن لەوەی کەماوە لەبەرئەوە ی سیٚ یان دەکەویٚ لە دوانزە بەش ودابەش ناکریٚ ژمارەی دوو مامەکە کەڕەت دەکەین لە (١٢ ) ە کە مەسئەلەکە یە ( ٢×١٢ = ٢٤ ) دەکا کەوابوو ژنەکە شەش بەشی دەکەویٚ لە ( ٢٤ ) بەش وە دایکی هەشتی دەکەویٚ وە براکەی چواری دەکەویٚ وە دوو مامەکە شەشیان دەکەویٚ یەکی سیٚ .

(٥ ) ژنیٚك مردووە میٚردو کوڕ وکچیٚك و خوشکیٚکی دایك و باوکی و خوشکیٚکی باوکی وخوشکیٚکی دایکی هەیە .

| میٚرد | کوروکچ | خوشکی باوك و دایکی | خوشکی باوك | خوشکی دایکی | مسئلە |
|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | ماوە للذکر مثل حظ الأنثیین | بیٚ بەش | بیٚ بەش | بیٚ بەش | ٤ |
| ١ | ٣ | | | | |

میٚرد بیٚ بەش نابیٚ بە تەواوی وە خوشکە دایك و باوکییەکە و خوشکە باوکییەکە و خوشکە دایکییەکە لە خاوەن بە شەکانن وە بیٚ بەش دەبن بە کوڕ و کچەکە چونکە ئەمانە عەصەبەن لە پیٚشترن لەوان ، میٚردەکە چوار یەك وەردەگریٚت ، وە کوڕ و کچەکە ئەوەی مایەوە وەری دەگرن ، کوڕەکە نیوەی میراتەکە وەردەگریٚ وە کچەکە چواریەك ، واتە : ئەوەی مایەوە لە دوای دانی بەشی میٚردەکە دەکریٚ بە سیٚ بەشەوە دوو بەشی بۆ کوڕەکە و یەك بەشی بۆ کچەکە .

(٦) پیاویٚکی ئازادکراو مردووە : کوڕیٚکی گەورەکەی هەیە کە ئازادی کردووە جەگە ئەو میراتگری تری نییە ، کوڕی ئازادکاری هەموو ماڵەکەی وەردەگریٚ چونکە کەس لە پیٚشی نییە بۆ وەرگرتنی میرات .

(٧) ژنێك مردووه دایك و مێردێكی هەیە : دایك و مێردەكە لە خاوەن بەشەكانن ، وە لای جمهور دایكەكە زیادە ڕێز و جیاوازییەكی هەیە لە گەڵ مێردەكەدا ئەوەی بمێنێتەوە لە میرات دەگەڕێتەوە بۆ لای دایكەكە .

| مێرد | دایك | مسئلە |
| --- | --- | --- |
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{3}$ + ماوە | ٦ |
| ٣ | ١+٢ | |
| | ٣ | |

مێردەكە نیوەی میراتەكە وەردەگرێ چونكە فەرعی میرات گر نییە نە ئەولاد نە ئەولادی ئەولادی مردووە نییە ، دایكەكە سێ یەكی $\frac{1}{3}$ هەموو میراتەكە وەردەگرێ یەكەم جار ، وە شەش یەكی $\frac{1}{6}$ واتە : یەك بەش لە شەش بەش دەمێنێتەوە دەگەڕێتەوە بۆ دایكەكە .

(٨) پیاوێك مردووە : ژن ونەنكی دایكی باوكی،٢خوشكی دایكی هەیە :

| ژن | نەنك | دوو خوشكی دایكی | مسئلة |
| --- | --- | --- | --- |
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{3}$ | ١٢ |
| ٣ | ٢+١ ی ماوە | ٤+٢ ی ماوە | |
| | ٣ | خوشكێك = ٣ | |

هەموو یەكێك لەمانە خاوەن بەشن : ژنەكە لای جمهور هیچی بۆ ناگەڕێتەوە لەو ماوە ، مەسئەلەكە لە (١٢) یە ، ژنەكە چوار یەك $\frac{1}{4}$ی ماڵەكە وەردەگرێ واتە : سێ بەش لە دوانزە بەش ، نەنكەكە شەش یەك $\frac{1}{6}$ ی ماڵەكە وەردەگرێ واتە : دوو بەش لە دوانزە بەش ، دوو خوشكەكە سێ یەك $\frac{1}{3}$ ی ماڵەكە وەردەگرن واتە : چوار بەش لە دوانزە بەش ، وەردەگرێ لە دوای ئەم دابەش كردنە چوار یەكی($\frac{1}{4}$)میراتەكە دەمێنێتەوە واتە : سێ بەش لە دوانزە بەشەكە دەگەڕێتەوە بۆ نەنك و دوو خوشكەكە یەكی بەشێكی تر وەدەگرن .

## باب الفروض المقدرة في كتاب الله تعالى

## بەشە دیاریکراوەکان لە قورئانی پیرۆزدا

(الفروض) کۆی (فرض) ە لە زمانی عەرەبیدا بە واتای : بڕین و دیاری کردن و ڕوونکردنەوە هاتووە ، وەردەگرێ لە زاراوەی زانایاندا بە واتای : بەشی دیاری کراو لە میراتدا هاتووە .

**وأعلم بأن الإرث نوعان هما : فرض ، وتعصيب ، على ما قسما**

بزانە بێ گومان میرات دوو جۆرە ئەو دوانە – میرات بە هۆی دانان و تەعصیب لە سەر ئەوەی دابەش کراوە .

**فالغرض في نص المتاب ستة لا فـــرض في الإرث ســـواها البتة**

ئەوەی لە دەقی قورئانا دانراوە شەشە – بەش نییە لە میراتا جگە ئەو شەشە .

**نصف ، وربع ، ثم نصف الربع والثـــلث ، والسدس ، بنص الشرع**

نیوە و چوار یەك ، لە پاشا نیوەی چوار یەك – سێ یەك و ، شەش یەك ، بە دەقی شەرع .

**والثـلثـان ، وهمـــا التـمام فاحـفـــظ فكـــل حـــافظ إمـــام**

دووسێ یەك ، بەم دوانە شەش تەواوە – دەرخی کە هەموو خاوەن دەرخێ لە سەر خەڵك پێشخراوە .

میراتێ ئیجماع لە سەریەتی دوو جۆرە :

یەکەم : میراتێ دیاری کرابێ .

دووەم : میراتێ عەصەبە بێ .

پێناسەی عەصەبە : عەصەبە ئەو کەسانەن کە لە قورئان و حەدیسدا بەشیان بۆ دیاری نەکراوە . شەریعەتی ئیسلام ٣/٤٣ .

**ئەو بەشانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا باس کراون شەشن :**

(١) النصف : نیوە : $\frac{1}{2}$

(٢) الربع : چوار یەك : $\frac{1}{4}$

(٣) الثمن : هەشت یەك : $\frac{1}{8}$

(٤) الثلثان : دوو سێ یەك $\frac{2}{3}$

(٥) الثلث : سێ یەك $\frac{1}{3}$

(٦)السدس : شەش یەك $\frac{1}{6}$

بەڵێ بەشی حەوتەم دانراوە بە ئیجتیهاد ئەویش سێ یەکی ماوەیە بۆ باپیر لە هەندێ حاڵەتدا لە گەڵ براکاندا .

## باب من له النصف

## ئەو کەسەی نیوەی بۆ هەیە

**فالنصف فرض خمسة أفراد : الـــــزوج ، والأنثى من الأولاد**

نیو : بەشی پێنج کەسە کە تاك بێ – مێرد ، مێیەکی تاك لە ئەولاد بێ

**وبنت الإبن عند فقـــد النبت والأخـــــت في مذهـــب كل مفـتي**

کچی کور کە تاك بێ لە کاتی نەبوونی کچدا – خوشکی تاك لە مەزهەبی هەموو موفتییەکدا .

**وبعدها الأخت التي مـــن الأب عـــنـــد إنفــرادهن عـــن معصب**

لە دوای خوشك خوشکێ لە باوکی بێ – لە کاتی تاکی هەموو یەکێ لەمانە لەوەی بیکا بە عەصەبە ئەمە دەست پێ کردنە بەو کەسانەی کە شیاوی بەش بن :

(نصف) : نیوە : **بەشی پێنج تاقمە کە تاك بن کە ئەمانەن :**

(١) مێردێك کە ژنەکەی ئەولاد و ئەولادی ئەولادی خاوەن میراتی نەبێ یەکسانە نێر بێ یان مێ ، چ لەو مێردە بێت چ لە غەیری ئەو مێردە وەردەگرێ. وەکو فەرموودەی خودای گەورە ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُنَّ وَلَدٌ ﴾سورة النساء،الآية ١٢ . واتە : بۆ ئێوە هەیە نیوەی ئەوەی کە هاوجووتەکانتان لە پاش مردن بە جێیان هێشتووە ئەگەر ئەولادیان نەبێ ، واتە نەتەوەی میراتگر .

نمونە : ژنێك مردووە : مێردەکەی ، دوو برای باوك و دایکی هەیە ، (٢٠٠) دیناریشی لێ بە جێ ماوە ، ئایا ئەم پارەیە چۆن دابەش دەکرێت ؟

| مێرد | دایك | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە | ٢ |
| ١ | ١ | |

ئەو ئەندازە پارە دابەش دەکەی بە سەر مەسئەلەکەدا : پاشان پشکێك دەردەچێت ئەو پشکە کەرەتی بەشی مێردەکەی دەکەیت کە یەکە بەشی دەردەچێ ، کەرەتی بەشی براکەشی دەکەی بەشەکەی دەردەچێ ، راهێنانی هەموو مەسەلەیە بەم شێوەیە :

٢٠٠ ÷ ٢ = ١٠٠ دینار پشکێك .

١٠٠ × ١ = ١٠٠ دینار بەشی مێرد .

١٠٠ × ١ = ١٠٠ دینار بەشی برا .

(٢) کچ [١]: واتە ئەو کچەی خوشك و برای خۆی لە گەڵدا نەبێ وەك خودای گەورە دەفەرموێ ﴿وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ﴾ سورة النساء الآية ١١ .واتە:ئەگەر نەتەوەی مردووەکە یەك کچ بوو نیوەی میراتەکە دەبا .

---

(١) کچ سێ حاڵەتی بۆ هەیە :

یەکەم : نیوە کە باسمان کرد . دووەم :دوو سێ یەکی ، واتە : دوو بەش لە سێ بەشی ماڵ ، ئەمەش بەشی دوو کچە یا زیاتر بەو مەرجەی کە برایان لە گەڵدا نەبێ . نمونە : پیاوێك مردووە : ژنێك و دوو کچ و باوك و کچی کوڕێکی هەیە . وەردەگرێ (٢٤٠٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا؟

| ژن | دوو کچ | کچی کور | باوك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ٢/٣ | بێ بەش | ١/٦ + ماوە | ٢٤ |
| ٣ | ١٦ | | ٤+١ = ٥ | |

٢٤٠٠÷ ٢٤ = ١٠٠ پشکێك . ١٠٠ × ٣ = ٣٠٠ دینار بۆ ژن . ١٠٠ × ١٦ = ١٦٠٠ دینار بۆ دوو کچ . ١٠٠ × ٥ = ٥٠٠ دینار بۆ باوك .

سێهەم لە حاڵەتی کچ : یەکسانە یەك کچ بێ یا زیاتر کوڕێکی نێر لە پلەکەیدا بوو دەیکاتە عەصەبە ، وەکو فەرموودەی خودای گەورە ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ ) سورة النساء الآية ١١ . واتە : خودا وەسییەتان بۆ دەکات لە هۆی میراتی منداڵەکانتانەوە لە کوڕ و کچدا لە بۆ کوڕ هەیە دوو ئەوەندەی بەشی کچ .

نمونە : – ژنێك مردووە : باوك و دایك و كچێك و مێردەكەی و برایەكی دایك و باوكی هەیە ، وەردەگریٚ (٣٩٠٠) دیناری لیٚ بە جێماوە بەشی هەموو یەگیٚ لە میراتگرەكان چەندە ؟

| مێرد | كچ | باوك | دایك | برا | مسئلە |
|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$+ماوە | $\frac{1}{6}$ | بیٚ بەش | ١٢ |
| ٣ | ٦ | ٢ | ٢ | | بەرزدەبێتەوە بۆ ١٢ |

٣٩٠٠÷ ١٢ = ٣٠٠ دینار پشكێك

٣٠٠×٣= ٩٠٠ دینار بەشی مێرد . ٣٠٠×٦ = ١٨٠٠ دینار بەشی كچ .

٣٠٠×٢=٦٠٠ دینار بەشی باوك . ٣٠٠×٢=٦٠٠ دینار بەشی دایك .

(٣) تاقە كچێكی كوڕ[1] كە نە خوشك وبرا و نە ئەولادی مردووەی لە گەڵدا نەبیٚ وەكو فەرموودەی خودای گەورە ﴿وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ﴾ سورة النساء الآیة ١١ .

---

بۆ نمونە : پیاوێك مردووە : سیٚ كچ و كوڕێك و دایكی و برایەكی باوكی هەیە (٦٣٦) دیناری لیٚ بە جیٚ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| ٣كچ ١كور | دایك | برای باوكی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| باقی للذكر مثل حظ الأنثيين | $\frac{1}{6}$ | بیٚ بەش | ٦ |
| ٥ | ١ | | |

٦٣٦÷ ٦ = ١٠٦ دینار پشكێك . ١٠٦ × ١ = ١٠٦ دینار بەشی دایك .

١٠٦ × ٥ = ٥٣٠ دینار بەشی ٣كچ و كورەكە ، كوڕەكە ٢١٢ دیناری دەكەویٚ و هەریەك لە كچەكان ١٠٦ دیناریان دەكەوێت .

(١) : كچی كوڕ پێنج حاڵەتی بۆ هەیە :

یەكەم : نیوە : یەك كچی كوڕ وەك باسمان كرد .

دووەم : دوو سێ یەك ، واتە دوو لە سەر سێ . ئەویش هی دوو کچی کوڕ یا زیاتر بە مەرجێ نە لە گەڵ برای خۆیانا و نە لە گەڵ چینێکی لای سەرووی خۆیانا نەبن لە ئەولاد و ئەولادزای مردووەکە .

وەکو فەرموودەی خودای گەورە ﴿فان کن نساء فوق اثنتین فلهن ثلثا ما ترك﴾ سورة النساء الآية ١١ . واتە : ئەگەر ئەولادەکان هەر کچ بن و زیاتر لە دوو کەس ئەوە دوو تەقسیم سێ دەبەن لەوەی بە جێ ماوە لە مردووەکە .

نمونە : پیاوێك مردووە : دوو کچی کوڕ و باپیر و دایکی و دایکی دایکی هەیە ، وەبڕی ( ٣٠٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| ٢کچی کور | باپیر | دایك | دایکی دایك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ٢/٣ | ١/٦ +ماوە | ١/٦ | بێ بەش | ٦ |
| ٤ | ١ | ١ | | |

٣٠٠ ÷٦=٥٠ دینار پارەی پشکێك

٥٠×٤=٢٠٠ دینار بەشی دوو کچەکە یەکی ١٠٠ دیناریان دەکەوێ .

٥٠×١=٥٠ دینار بەشی باپیر .   ٥٠×١ = ٥٠ دینار بەشی دایك .

سێهەم : ماوە تاقە کچی کوڕێك بێ یا زیاتر لە گەڵ کوڕی کوڕی مردوودکەدابێ لە پلەی خۆیدا وەك برای یا کوڕی مامی کچەکە .

نمونە : پیاوێك مردووە : کچی کوڕێك و کوڕی کوڕێك ، برایەکی باوکی و دایکی هەیە وە بڕی(١٢٣) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| ٢کچ کور و کوڕی کوڕ | برای باوکی ودایکی | مسئلە |
|---|---|---|
| هەموو ماڵەکە بۆ ئەم دوانە دەبێت بەڵام کورەکە دوو ئەوەندەی کچەکە دەبات | بێ بەش | ٣ |

١٢٣ ÷٣=٥١ دینار پارەی پشکێك

٥١×٢=١٠٢ دینار بەشی کورەکە .

٥١×١=٥١ دینار بەشی کچەکە .

نمونە : پیاوێك مردووە : کچی کوڕێکی و باوك و دایك و برایەکی باوکی شەیە . وە بڕی (٦٠٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| کچی کور | باوك | دایك | برا | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ + ماوە | ١/٦ | بێ بەش | ٦ |
| ٣ | ٢=١+١ | ١ | | |

٦٠٠÷٦= ١٠٠ دینار پشکێك .١٠٠×٣ =٣٠٠ دینار بەشی کچی کوڕ.

---

چواردم : شەش یەك : تاقە کچێکی کوڕێك بێ یا زیاتر بەو مەرجەی لە گەلٚ کچی مردرودکەدا بێت . یا لە گەلٚ کچی کورێکی لە خۆی بەرەو ژوورتر دا نەبێ و برایشی لە گەلْدا نەبێ .پێغەمبەر (ﷺ) حوکمی کردووە بەم شەش یەکە بۆ کچی کوڕ . بوخاری ریوایەتی کردووە .

نمونە : پیاوێك مردووە : کچێك و کچی کوڕ و باوك و ژنێکی هەیە وە بڕی (٦٠٠) دیناری لێ بە جێ ماوە . ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| کچ | کچی کوڕ | باوك | ژن | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ +ماوە | ١/٨ | ٢٤ |
| ١٢ | ٤ | ٥=١+٤ | ٣ | |

٦٠٠÷٢٤= ٢٥ دینار پشکێك . ٢٥×١٢=٣٠٠ دینار بەشی کچەکە . ٢٥×٤=١٠٠ دیناربەشی کچی کوڕ . ٢٥×٥=١٢٥ دینار بەشی باوك . ٢٥×٣=٧٥ دینار بەشی ژن .

پێنجەم : بێ بەش : کچی کوڕ بێ بەش دەبێ یەکێك بێ یا زیاتر بە کوڕ و کوڕی کوڕ کە پلەی لەو ژوورتر بێت . وەردەگرێ بە دوو کچی مردووە ، وەردەگرێ بە دوو کچی کوڕ کە نزیك تر بێ لە مردووەکە لەو کچی کوڕە ، .

نمونە : ژنێك مردووە کوڕێك و کچی کوڕ وباوك ودایك مێردی هەیە ، ودبڕی (١٢٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| اکور | کچی کوڕ | باوك | دایك | مێرد | مسئلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ماوە | بێ بەش | ١/٦ | ١/٦ | ١/٤ | ١٢ |
| ٥ | | ٢ | ٢ | ٣ | |

١٢٠÷١٢=١٠ پشکێك . ١٠×٥=٥٠ دینار بەشی کور . ١٠×٢= ٢٠ دینار بەشی باوك .
١٠×٢= ٢٠ دینار بەشی دایك . ١٠×٣=٣٠ دینار بەشی مێرد .

۱۰۰×۲=۲۰۰ دیناربەشی باوك . ۱۰۰×۱ = ۱۰۰ دینار بەشی دایك .

(٤) یەك خوشكی دایك و باوكی[1] كە برای لە گەڵدا نەبێ وەكو فەرموودەی خودای گەورە ﴿إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا

---

(۱) : خوشكی دایكی و باوكی چوار حاڵەتی بۆ هەیە :

حاڵەتی یەكەم : نیوە : بەشی یەك خوشكی دایك و باوكییە كە برای لە گەڵدا نەبێت وەك باسكرا .

حاڵەتی دووەم : دوو سێ یەك : بۆ دوو خوشكی دایك و باوكی یا زیاتر لە دوو خوشك ، بەو مەرجەی نە لە گەڵ برای خۆیانا نە لە گەڵ ئەولادی مردووەكەدا بن . وەكو فەرموودەی خودای گەورە ﴿فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾ سورة النساء الآية ۱۷٦ . واتە : ئەگەر خوشكەكان دووان بوون ئەوە دوو سێ یەكیان بۆ هەیە لەو ماڵەی بە جێ ماوە لە مردووەكە .

نمونە : پیاوێك مردووە ژنێك و دوو خوشكی دایك و باوكی مامێكی هەیە ، بڕی (۱۸۰۰) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| ژن | دوو خوشك | مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ۱/٤ | ۲/۳ | ماوە | ۱۲ |
| ۳ | ۸ | ۱ | |

۱۸۰۰÷۱۲= ۱۵۰ دینار پارەی پشكێك .

۱۵۰×۳=٤٥۰ دینار بەشی ژن .

۱۵۰×۸= ۱۲۰۰ دینار بەشی دوو خوشك . ۱۲۰۰÷۲= ٦۰۰ بەشی یەك خوشك.

۱۵۰×۱=۱۵۰ دینار بەشی مام .

حاڵەلتی سێهەم : ماوە : وەردەگرێ ئەو خوشكە لە گەڵ برای دایك و باوكی دا وەكو فەرموودەی خودای گەورە ﴿وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ﴾ سورة النساء الآية ۱۷٦ . واتە : ئەگەر ئەو میراتبەرانە كە سیفەتی برایەتی یان خوشكایەتیان هەیە لە دایك و باوكەوە یان هەر لە باوكەوە كۆمەڵێ بوون پیاو و ژن ئەوە بۆ نێرینەكان دوو قاتی بەشی مێینەكان هەیە .

ئەمە (عصبة بالغير) ە وەردەگریٚ هەروەها ماوە وەردەگرن لە گەڵ فەرعی میرات بەری مێنگینەدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویٚ (( إجعلوا الاخوات مع البنات عصبة ) اعلام الموقعين ١ / ٣٦٦ لە کتێبی حکم المیراث وەرگیراوە . چەند خوشکێک لە گەڵ چەند کچێکدا بیکەن بە عەصەبە .

نمونە : پیاوێك مردووە ، برایەکی باوکی و دایکی پێنج خوشکی باوکی و دایکی و دایك و سیٚ ژنی هەیە ، وە بڕی(١٦٨) دیناری لیٚ بە جیٚ ماوە . ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| ١ برا ٥خوشك | دایك | ٣ ژن | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ماوە للذکر مثل حظ الأنثيين | ١/٦ | ١/٤ | ١٢ |
| ٧ | ٢ | ٣ | |

١٦٨÷١٢=١٤ دینار پارەی پشکێك .

١٤×٢=٢٨ دینار بەشی دایك .

١٤×٣= ٤٢ دینار بەشی ژنەکان ÷ ٣ = ١٤ دینار بۆ یەك ژن .

١٤×٧=٩٨ دینار بۆ براو خوشکەکان ، هەر خوشکێك ١٤ دیناری دەکەویٚ ، براکەش ٢٨ دیناری دەکەویٚ .

حاڵەتی چوارەم : بیٚ بەش : خوشك بیٚ بەش دەبێت بە میرات بەری نێرینە هەرچەند بەرەوخوار بڕوا بە باوکیش بیٚ بەش دەبێت .

نمونە : پیاوێك مردووە : باوك ، دایك ، پێنج خوشکی باوك و دایکی هەیە وە بڕی( ١٥٦ ) دیناری لیٚ بە جیٚ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| دایك | باوك | ٥ خوشکی باوك و دایکی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ماوە | بیٚ بەش | ٦ |
| ١ | ٥ | | |

١٥٦÷٦=٢٦ دینار پارەی پشکێك . ٢٦×١= ٢٦ دینار بۆ بەشی دایك .

٢٦×٥= ١٣٠ دینار بۆ بەشی باوك .

تَرَكَ﴾ سورة النساء الآية ١١ . واتە : ئەگەر کەسێ بمرێ و ئەولادی لە پاش بە جێ نەمێنێ خوشکێکی باوك و دایکی یا خود هەر باوکی ببێ ئەوە نیوەی ماڵی مردووەکە دەبات لەوەی بە جێی هێشتووە .

نمونە : پیاوێك مردووە : خوشکێکی باوکی و دایکی و ژنێك و کوڕێکی مامی هەیە بڕی (٢٦٠٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| خوشك | دایك | ژن | کوری مام | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ١ + ماوە | ١ | ماوە | ١٢ |
| ٢ | ٣ | ٤ | هیچ نەماوە | بەرز دەکرێتەوە |
| ٦ | ٤ | ٣ | | بۆ ١٣ |

٢٦٠٠÷١٣=٢٠٠ دینار پارەی پشکێك .

٢٠٠×٦= ١٢٠٠ دینار بەشی خوشکی دایك و باوکی .

٢٠٠×٤ = ٨٠٠ دینار بەشی دایك . ٢٠٠×٣= ٦٠٠ دینار بەشی ژن .

(٥) یەك خوشکی باوکی[1] : نەبراو نەکوڕ و کچی مردووە کە و نە خوشکی باوکی دایکی لە گەڵدا بێ هەروەها مردووەکە باوکی نەبێ .

---

(١) : خوشکی باوکی پێنج حاڵەتی بۆ هەیە :

حاڵەتی یەکەم : نیوە ، وەك لە سەروە باسمان کرد .

حاڵەتی دووەم : دوو سێ یەك : بۆ دوو خوشك یا زیاتر بەو مەرجانەی کە لە حاڵەتی یەکەمدا باسمان کرد .

نمونە : پیاوێك مردووە دوو خوشکی باوکی و ژنێك و دایکی دایکی و مامێکی هەیە ، وە بڕی(١٣٠٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| ژن | دوو خوشکی باوکی | دایکی دایك | مام | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ٢ | ١ | ماوە | ١٢ |
| ٤ | ٣ | ٦ | | |
| ٣ | ٨ | ٢ | | |

١٣٠٠ ÷ ١٢= ١٠٠ دینار پارەی پشکێك . ١٠٠÷٣= ٣٠٠ دینار بەشی ژن . ١٠٠×٨ = ٨٠٠ دینار بەشی دوو خوشکی باوك . ١٠٠×٢= ٢٠٠ دینار بەشی دایکی دایك .

حاڵەتی سێهەم : شەش یەك . بۆ خوشکی باوکییە یکێك بێ یا زیاتر بەو مەرجەی لە گەڵ خوشکێکی باوکی و دایکی دا بێ و برایشی لە گەڵ نەبێ .

نمونە : پیاوێك مردووە : خوشکێکی باوك ودایك ، خوشکێکی باوکی ، دایك ، ژنێکی هەیە وە بڕی(١٣٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، چۆن دابەش دەکرێت ؟

| ژن | دایك | دوو خوشکی باوکی | خوشکی باوکی | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ١/٢ | ١/٦ | ١٢ |
| | | | | بەرزدەکرێتەوە بۆ |
| ٣ | ٢ | ٦ | ٢ | ١٣ |

١٣٠÷١٣= ١٠ دینار پارەی پشکێك ١٠× ٣= ٣٠ دینار بۆ بەشی ژن .

١٠×٢=٢٠ دینار بەشی دایك . ١٠×٦ = ٦٠ دینار بەشی خوشکی دایك و باوکی .

١٠×٢= ٢٠ دینار بەشی خوشکی باوکی .

حاڵەتی چوارەم : ماوە وەردەگرێ لە گەڵ برای باوکیدا لەگەڵ فەرعی میرات بەری مێینە لە کاتی نەبوونی خوشکی دایك و باوکی .

نمونە : ژنێك مردووە : مێرد ، دووبرا و یەك خوشکی باوکی هەیە بڕی ( ١٩٨) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| مێرد | ٢خوشکی باوکی و برایەکی باوکی | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە | ٤×٢ |
| | للذکر مثل حظ الأنثیین | ٨ |
| ١ | ١ | |
| ٤ | ٤ | |

١٩٨÷٢= ٩٩ دینار بەشی پشکێك . ٩٩×١= ٩٩ دینار بەشی مێرد .

٩٩×١= ٩٩ دینار بەشی دوو خوشك و برا . ٩٩÷٤= ٢٤,٧٥٠ دینار بەشی یەك خوشك . ٢٤,٧٥٠×٢= ٤٩,٥٠٠ دینار بەشی برا .

حاڵەتی پێنجەم : بێ بەشە خوشکی باوکی بە باوك یا فەرعی میرات بەری نێرینە وەردەگرێ برای باوکی و دایکی مردووەکە بە هۆی کۆبوونەوەی چەند خوشکێکی باوك و دایکی لە گەڵ فەرعی میرات بەری مێینە وەردەگرێ کاتێ چەند خوشکێکی

نمونه : پیاوێك مردووه : خوشكی باوكی ، ژنێك ، دایك ، نەنكی هەیە ، وە بڕی(١٣٠٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| خوشكی باوك | دایك | ژن | دایكی دایك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ١/٤ | بێ بەش | ١٢ |
| | | | | بەرز دەكرێتەوە |
| ٦ | ٤ | ٣ | | بۆ ١٣ |

١٣٠٠÷١٢= ١٠٠ دینار پارەی پشكێك .١٠٠÷٦= ٦٠٠ دینار بەشی خوشكی باوكی .١٠٠×٤ = ٤٠٠ دینار بەشی دایك .١٠٠×٣= ٣٠٠ دینار بەشی ژن .

---

باوكی و دایكی دووسێ یەك وەرگرن خوشكی باوكی بێ بەشە سەگەر كاتێ نەبێ خوشكی باوكییەكە برای باوكی لەگەڵ بێ ماوە وەرگرن ئەوەلەو كاتەدا بێ بەش نین .

نمونه : پیاوێك مردووه : ژنێ ،دایك ،باوك ، دوو خوشكی باوكی هەیە ، بڕی (١٢٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| ژن | دایك | باوك | ٢خوشكی باوكی | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ماوە | بێ بەش | ١٢ |
| ٣ | ٢ | ٧ | | |

١٢٠÷١٢= ١٠ دینار پارەی پشكێك .        ١٠×٣= دینار بەشی ژن .

١٠× ٢= ٢٠ دینار بەشی دایك        ١٠× ٧= ٧٠ دینار بەشی باوك .

## باب أصحاب الربع

## باس لەو کەسانە دەکات کە چوار یەك وەردەگرن

**والربع فرض الزوج إن كان معه   من ولد الزوجة من قد منعة**

چواریەك بەشی مێردە ئەگەر لە گەڵیا بێ - لە منداڵی ژنەکەی کە بەربەست بێ لە نیوە بیگێڕێتەوە بۆ چواریەك .

**وهو لكل زوجة أو أكثرا   مع عدم الأولاد فيما قدرا**

چوار یەك بەشی هەموو ژینێکە لە زیاتر لە ژنێك - لە گەڵ نەبوونی منداڵی مێردەکەی لەوەی بۆی دانراوە کە چوار یەکە

**وذكر أولاد البنين يعتمد   حيث إعتمدنا القول في ذكر الولد**

وە باسکردنی ئەولادی کوڕ پشتی پێ دەبەسرێ - لە جێگایەکا پشتمان پێبەستبێ بە ئەولاد کوڕ بێ یا کچ لەوەی بەربەستی مێرد بکا لە نیوە وە بۆ چواریەك .

**چوار یەك بەشی دوو تاقمە لە میرات بەران :**

تاقمی یەکەم : بەشی مێردە کە ژنەکەی منداڵ یا کوڕەزای میرات بەری بێ یەکسانە ئەو منداڵە لەو مێردەی بووبێتی یا لە مێردێکی دی بوو بێتی وەك فەرموودەی خودای گەورە﴿فَإِنْ كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ﴾ النساء/ ١٢.

واتە: ئەگەر ئەو هاوسەرانەتان نەتەوەی میراتکیان ببێ ئەوەی بۆ ئێوە هەیە چواریەکی ئەوەی ئەوان بە جێیان هێشتووە .نمونە:ژنێك مردووە :مێرد ، کوڕ کچێك ، برایەکی هەیە ، بڕی ( ٤٠٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| مێرد | کوڕ و کچ | برا | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ماوە<br>للذكر مثل حظ الأنثيين | بێ بەش | ٤ |
| ١ | ٣ | | |

٤٠٠÷٤= ١٠٠دینار پارەی پشکێك . ١٠٠×١= ١٠٠دینار بەشی مێرد[1].

١٠٠×٣=٣٠٠دینار بەشی کوروکچ،٢٠٠ بەشی کور،١٠٠ دینار بەشی کچ .

**تاقمی دووەم** : بەشی ژنێکە[2] یا چەند ژنێك تا چوار لە گەڵ نەبوونی ئەولادی مێردەکەی یا ئەولادی کوڕەکەی یەکسانە لەو ژنە بووبێت یا لە ژنێکی تر وەکو فەرموودەی خوودای گەورە ﴿وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكُمْ وَلَدٌ﴾ سورة النساء الآیة ١٢ . واتە : بۆ ژنەکانتان هەیە چوار یەکی ئەوەی بە جێتان هێشتووە ئەگەر ئێوە نەتەوەی میراتگرتان نەبێ .

نمونە : پیاوێك مردووە : ژنێك ، دایك ، دوو برای دایکی ، برایەکی باوك و دایکی هەیە ، وە بڕی ( ٣٦٠) دیناری لێ بە جێ ماوە . ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| مێرد | دایك | دووبرای دایکی | برایەکی باوك ودایکی | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{3}$ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٢ | ٤ | ٣ | |

٣٦٠×١٢=٣٠ دینار بۆ پشکێك .    ٣٠× ٣= ٩٠ دینار بەشی ژن .

٣٠×٢=٦٠دینار بەشی دایك. ٣٠×٤=١٢٠دینار بەشی دوو برای دایکی .

٣٠× ٣ = ٩٠ دینار بەشی برای باوك و دایکی .

لە هۆنراوەکەدا هاتووە(والربع ... الی آخر الأبیات)واتە:بۆ مێردە چواریەك گەر لە گەڵیدا بێ منداڵی ژنەکەی منداڵێ بێ کە بەربەستی بکا لە نیوە ( $\frac{1}{2}$ ) بۆ چوار یەك ($\frac{1}{4}$) ئەو منداڵە نێر بێ یا مێ بەڵام بەرپەستی نەبێ لە بەرپەستە پێشووەکان گەر بەو منداڵەوە بەربەستێك بوو وەك ئەوەی منداڵەکە دایکی

---

(١) : وە مێرد دوو حاڵەتی بۆ هەیە : یەکەم : نیوە وەك لە سەرود باسمان کرد . دووەم : چواریەك وەك لە سەرەوە هاتووە .

(٢) : ژن دوو حاڵەتی بۆ هەیە : یەکەم : چواریەك کە لە سەروە باس کرا . دووەم : هەشت یەك کە لە دوای ئەم باسەوە دێت إنشاء الله .

خۆی کوشتبێت ئەو منداڵە بوون و نەبوونی وەك یەك وایە وە لەو کاتەدا باوکی بەربەست ناکا لە نیوە بۆ چوار یەك .

وە هەروەها لە هۆنراوەکەدا هاتوە ( وذکر أولاد البنین یعتمد. الخ ) واتە : لە هەر جێگایەکدا پشت بەسترا بە بوونی منداڵ لە بەربەست کردنی مێرد لە نیوە بۆ چوار یەك ، دووبارە پشت دەبەستین لە بوون و نەبوونی کورەزا لە بەر ئەوەی بە ئیجماعی زانایان کوڕەزا وەك کوڕ وایە لە میرات و بەربەست و عەصەبەدا .

## باب من له الثمن

## ئەوەی کە هەشت یەك ( $\frac{1}{8}$ ) وەردەگرێت

**والثمـــن للزوجـــة والزوجــات مــــع البنيـــن ، أو مع البنـــات**

هەشت یەك بەشی ژنێکە یا چەند ژنێك – لە گەڵ بوونی کوڕان یا لـە گـەڵ بوونی کچێك لە کچانی مردووەکە .

**أو مـــع أولاد البنيـــن فأعلم ولا تظـن الجمع شـــرطا فـــافهم**

یا لە گەڵ بوونی کوڕەزا نێر بن یا مێ ئەمە بزانە – گومان مەبە کۆی کوڕ و کچ وکوڕەزا مەرجە تێ بگە .

هەشت یەك ($\frac{1}{8}$) بەشی ژنێکە یا چەند ژنێك لە کاتی بوونی ئەولاد یا کـوڕەزا نێربێ یـا مـێ بـە ئیجمـاع زانایـان لـە بـەر ئـەوەی خـودای گـەورە دەفـەرموی ﴿فَإِنْ كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ﴾ سورة النساء الآيـة ١١ .واتـه : ئەگەر ئێوە نەتەوەی میراتگرتان ببێ ئەوە بۆ ژنەکانتان هەشت یەك هەیە .

نمونـە : پیاوێك مـردووە : ژنێك ، و دوو کـوڕ ، بـەڵام یـەکێکیان بـاوکی کوشتوە ، و مامێکی هەیە ، وە بڕی (٨٠٠) دینـاری لێ بە جـێ مـاوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| ژن | کوڕ | کوڕە بکوژەکە | مام | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | ماوە | بێ بەش | بێ بەش | ٨ |
| ١ | ٧ | | | |

٨٠٠÷٨= ١٠٠ دینار پارەی پشکێك ١٠٠×١= ١٠٠ دینار بەشی ژن .

١٠٠×٧=٧٠٠ دینار بەشی کوڕ.

بەسە بۆ بەربەست کردنی ژن لە چوار یەکەوە بۆ هەشت یەك بونی یـەکێك لە کوڕ یا کچ یا لە کوڕی کوڕ یا لە کچی کوڕ وەردەگرێ کۆیان مەرج نییە.

## باب من له الثلثان

### ئەوانەی دوو سێ بەشیانە

**والثلثان للبنات جمعا ما زاد عن واحدة ، فسمعا**

دوو سێ یەکبەشی کچە کە کۆبێ – ئەو کچە کە زیاد بێ لە یەکێك بە بیستنی گوێڕایەڵ بە

**وهو كذلك لبنات الإبن فافهم مقالي فهم صافي الذهن**

هەروەها دوو سێ یەك بەشی دوو کچی کوڕە یا زیاتر – تێبگە و بزانە ئەم قسەی منە بە تێگەشتنی بیری پوخت بێ لە گومان .

**وهو لأختين فما يزيد قضى به الأحرار والعبيد**

وەردەگرێ دوو سێ یەك بەشی دوو خوشکی باوك و داکییە یا دوو خوشکی باوکییە یا زیاتر – ئادەمیزادی ئازاد و بەندە حوکمی کردووە پێی .

**هذا إذا كن لأم وأب أو لأب ، فاعمل بهذا تصب**

ئەوەی باسم کرد لە بەشی دوو سێ یەك کاتێ خوشکەکان دایك و باوکی یان باوکی بن ، کار بکە پێی تۆ پێکاوتە .

دووسێ یەك بەشی چوار جۆرە لە جۆرەکانی میراتبەران :

یەکەم : بەشی کۆیەکە لە کچان ، لێرەدا مەبەست بە کۆ ئەوەیە : ئەوەی زیاد بێ لە یەك کۆیە . واتە دوو سێ یەك بەشی دوو کچە یا زیاتر .

دووەم : بەشی دوو کچی کوڕە یا زیاتر .

سێهەم : بەشی دوو خوشکی باوك و دایکە یا زیاتر .

چوارەم : بەشی دوو خوشکی باوکییە یا زیاتر .

ئەمانە هەمووی بە ئیجماع زانایانە لە بەر فەرموودەی خودای گەورە کە دەفەرمویٖ ﴿فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ﴾ سورة النساء الأية ١١ . واتە : ئەگەر ئەولادەکان هەر کچ بوون و زیاتر بوون لە دوو کەس ئەوە دوو تەقسیم سێ دەبەن لەوەی بە جیٚ ماوە ، وەردەگریٚ هەروەها خودای گەورە دەفەرموی ﴿فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾ سورة النساء الأية ١٧٦ . واتە : ئەگەر خوشکەکان دوان بوو بن ئەوە بۆ هەردووکیان دوو سیٚ یەکیان بۆ هەیە لەوەی بەجیٚ ماوە .

ئەوەی کە باسمان کرد جیاوازی نابـاوی تیٚدایـە : ئـەویش ئەوەیـە گیٚراویانەتـەوە لـە ئـیبن و عەباسـەوە کـە راو بۆچـوونی وابـووە بەشـی کـچ ناگۆڕیٚ لە نیوە بۆ دوو سیٚ یەك مەگەر کاتیٚ نەبیٚ کە سیٚ کچ بن ئەگەر دوو کچن حوکمەکەیان حوکمی یەك کچی هەیە واتە : هەر نیوە دەبەن ، ئەم رای ئیبن وعباسـەیان وەرنـەگرتووە زانایـانی هەرچـوار مەزهـەب بـەڵکو رای هـەموویان وایـە دوو کـچ وەك سیٚ کـچ وایـە واتـە : دوو کـچ دوو سـیٚ یـەك وەردەگرن وەسیٚ کچ .

ئیجماع زاناکان لە سەر ئەوەن ئەم ئایەتـە پیٚشووە هاتووەتـە خـوارەوە لـە ئـەولادی بـاوك و دایکـی و لـە ئەولادیباوکیـدا جگـە ئـەولادی دایکـی ، پیٚغەمبـەر (ﷺ) حـوکمی کـردووە بۆ دوو کـچی سـەعد بـە دوو سیٚ یـەك لـە میراتی باوکیاندا .

## باب من له الثلث

### ئەوەی بەشی سێ یەك ( $\frac{1}{3}$ ) وەردەگرێت

والثلث فرض الأم حيث لاولد ولا من الأخوة وجمع ذو عـدد

سێ یەك بەشی دایكە كاتێ مردووەكە منداڵی نەبێت – وەكۆ یەك لە براو خوشكی خاوەن ژمارەی نەبێ .

كاثـنيـن وثنتيـن أو ثـلاث حـكم الـذكور فيه كالإناث

وەك دووبرا یا دوو خوشك یاسیان لە خوشك و برا – بڕیاری نێرینە تێیدا وەك مێینە وایە

ولا إبـن إبـن معـها أو بنته ففرضها الثلث كمـا بينته

وە نەبێ لە گەڵ دایكدا كوڕی كوڕ یا كچی كوڕ – بەشی دایك سێ یەكە وەك روونم كردەوە .

وإن يـكـن زوج وأم وأب فثـلـث البـاقي لهـا مرتب

ئەگەر مەسئەلەكە تەنها مێرد و باوك و دایك بوو – سێ یەكی ماوە بۆ دایك رێك و پێك و دامەزراوە .

وهـكذا مـع زوجة فصـاعدا فـلا تكـن عن العلوم قـاعدا

هەوەها سێ یەكی ماوە بۆ دایكە لە گەڵ ژنێك یا زیاتر – لە پەیدا كردنی زانیاری وازمەهێنە .

وهو للإثـنيـن أو اثـنتيـن مـن ولـد الأم بغـيـر ميـن

سێ یەك بۆ دوو نێر یان دوو مێ – لە ئەولادی دایك بە بێ درۆ .

وهـكـذا إن كثـروا أو زادوا فـما لـهـم فيـما سـواه زاد

هەروەها سێ یەكیان بۆ هەیە ئەگەر زۆر بن یان زیاد بن لە دوو – جگە سێ یەك بۆ ئەو خوشك وبرایانی دایكە نییە تویشوو .

وتسـتوي الإنـاث والـذكور فيـه كمـا قد أوضح المسطور

یەكسانە نێر ومێكان –لە سێ یەك وئەوەی بی گومان قورئان روونی كردەوە .

## سیٚ یەك بەشی دوو جۆرە لە جورەكانی میرات :

### یەكەم : دایكە ، دایك سیٚ حاڵەتی بۆ هەیە :

(١) سیٚ یەك ( $\frac{١}{٣}$ ) ، دایك سیٚ یەك وەردەگریٚ بەو مەرجەی كە مردووەكە ئـەولادی نـەبیٚ كـوڕ بیٚـت یـا كـچ وە كوڕەزایـشی نـەبیٚت وەردەگـریٚ ژمارەیەكیشی لە خوشك وبرا نەبیٚت وەك فەرموودەی خودای گەورە ﴿فَـإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ﴾ سورة النساء الآية ١١ . واتـه ئەگـەر مردووەكـە نەتـەوەی نـەبوو وە بـەس بـاوك و دایكـی هـەبوو دایكەكـە لـەو میراتە سیٚ یەك دەبات .

نمونە : پیاویٚك مردووە دایك ، و باوك ، وباوكی باوكی هەیە وە بڕی( ٦٦٠) دیناری لیٚ بە جیٚ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكریٚت بە سەریاندا ؟

| دایك | باوك | باوكی باوك | مسئله |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٣}$ | ماوە | بیٚ بەش | ٣ |
| ١ | ٢ | | |

٦٦٠÷٣=٢٢٠ دینـار پـشكیٚك . ٢٢٠×١=٢٢٠ دینـار بەشـی دایـك .
٢٢٠×٢=٤٤٠ دینار بەشی باوك .

(٢) سیٚ یەكی ماوە : دایك سیٚ یەكی ماوە وەردەگریٚ لە دوای بەشی ژن یـان میٚـرد لـە دوو ویٚنـەدا كـە پیٚیـان دەوتریٚـت (غـراوین) لـە بـەر ئـەوەی پیٚچەوانەی قاعیدەیە وەك لە (الرحبیە) دا دەفەرمویٚ :

وان يكـــن زوج وام واب - فثلـث الباقي لها مرتب

وهكذا مع زوجة فصاعدا - فلا تكن عن العلوم قاعدا

وە پیٚـی دەوتریٚـت (العمـرتين) لـە بـەر ئـەوەی حـەزرەتی عومـەر حـوكمی كردووە پیٚی ، ئەو دوو ویٚنەیە ئەمانەن :

وێنەی یەکەم : ژنێك مردووە مێرد و دایك و باوك هەیە وە بڕی(٦٠٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| مێرد | دایك | باوکی | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٢ | ١/٣ ماوە | ماوە | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | |

٦٠٠÷٦= ١٠٠ دینار پشکێك . ٣×١٠٠= ٣٠٠ دینار بەشی مێرد .

١×١٠٠= ١٠٠دینار بەشی دایك . ٢×١٠٠= ٢٠٠ دینار بەشی باوك .

وێنەی دووەم : پیاوێك مردووە ژنێك و دایك و باوکی هەیە وە بڕی (٤٠٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| ژن | دایك | باوکی | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٤ | ١/٣ ماوە | ماوە | ٤ |
| ١ | ١ | ٢ | |

٤٠٠÷٤= ١٠٠ دینار پشکێك . ١×١٠٠= ١٠٠ دینار بەشی مێرد .

١×١٠٠= ١٠٠دینار بەشی دایك . ٢×١٠٠= ٢٠٠ دینار بەشی باوك .

تێبینی : دایك لەم دوو وێنەدا کە سێ یەکی ماوە وەردەگرێ دوای دانانی بەشی ژن و مێرد .

واتە : لەم مەسئەلەدا ژنەکە چوار یەکی دەکەوێ کە یەك بەش لەم مەسئەلەکە چوارە کەواتە سێ ی دەمێنێتەوە لە دوای بەشی ژنەکە ئەوچوارە سێی ماوە دایکەکە یەکێکی دەکەوێ وە دوانیش بۆ باوکەکە ، سێ یەکی ماوە لە راستیدا شەش یەکە لە وێنەی یەکەمدا وەچوار یەکە لە وێنەی دووەمدا لە بەر رێك بوونی لە گەڵ ووشەی قورئاندا و ئەدەب کردن لێی .

(٣) شەش یەك كە لەمەو دوا باس دەكرێت .

**دووەم : سێ یەك بەشی ژمارەیەك لە براوخوشكی دایكییــە**[1] وەك فـەرموودەی خـودای گـەورە ﴿فَإِنْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ﴾ سـورة الـنسـاء الآیـة ١٢ . واتـە : ئەگـەر ئەو بـرا یـان ئەو خوشـكە دایكییـە زیـاتـر بـوون لـە یەكێ دوو بن یا زیاتر – ئەوە هەموو یا هاوبەشن لە سێ یەكی میراتەكەدا .

نمونـە : پیاوێـك مـردووە : ژنێـك ، وخوشـكێكی بـاوك و دایكـی و دوو خوشكی دایكی و دایكی دایكی هەیە ، وە بڕی ( ١٥٠) دینـاری لێ بـە جـێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| ژن | خوشكی باوك و دایك | ٢ خوشكی ٢برای دایك | دایكی دایك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٢ | ١/٣ | ١/٦ | ١٢ |
| | | | | بەرزدەكرێتەوە بۆ |
| ٣ | ٦ | ٤ | ٢ | ١٥ |

١٥٠÷١٥=١٠ دینار پشكێك . ١٠×٣= ٣٠ دینار بەشی ژن .

١٠×٦=٦٠ دینار خوشكی دایك و باوكی . ١٠ × ٤= ٤٠ دینار بەشـی خوشك وبرا . ١٠×٢=٢٠ دینار بەشی دایكی دایك .

---

(١) : براو خوشكی دایكی دوو حاڵەتی بۆ هەیە :

یەكەم : سێ یەك كە ژمارەیەك بن لە براو خوشك وەك باسمان كرد .

دووەم : شەش یەك ئەگەر یـەك خوشـك یـا یـەك بـرا ی دایكـی بـێ وەك لەمـەودوا دێـت باسی انشاء الله .

## باب السدس

### باسی ئەوانەی شەش یەك ($\frac{1}{6}$) وەردەگرن

**والسدس فرض سبعة من العدد          أب ، وأم ، ثم بنت إبـن وجد**

شەش یەك بەشی حەوت تاقمە لە ژمارەی میرات بەر   باوك و دایك لە پاشا كچی كوڕ وە باپیر .

**والأخت بنت الأب ، ثم الجدة          وولـد الأم تمـام العـدة**

خوشك كچی باوكە ، لە پاشا نەنكە – وەردەگریٚ ئەولادی دایك حەتەمە تەواوە ژمارەیان .

شەش یەك بەشی حەوت تاقمە لە ژمارەی میرات بەران ئەوانەیش بریتین : (١) باوك ، (٢) باپیر ، (٣) دایك ، (٤) نەنك ، (٥) كچی كوڕ ، (٦) خوشكی باوكی ، (٧) ئەولادی دایك نێر بیٚ یا میٚ .

خاوەنی (الرحبیە) بە كورتی باسی شەش یەكی كرد وەردەگریٚ لە پاشا باس و مەرجەكانی هەموو یەكێكی بە درێژی هێنا بە شوێنیاو فەرمووی :

**فالأب یستحقـه مـع الـولـد          وهكـذا الأم بتنزیل الصّـمد**

باوك شیاوی شەش یەكە لە گەڵ ئەوەی مردووەكە ئەولادی ببیٚ – هەروەها دایك شیاوی شەش یەكە بە ناردنی خودا لە قورئانا .

**وهكذا مع ولـد الإبـن الـذي          مـا زال یقفـو إثره ویحـتذي**

هەروەها شەش یەك میراتی باوك و دایكە لە گەڵ ئەوەی مردووەكە كوڕەزای بیٚ – كە بەردەوام بیٚ لە حوكمدا و شوێنی بكەویٚ و پەیرەوی بكا لە میراتدا .

**وهـو لهـا أیضـا مع الإثنین          من أخوة المیت ، فقس هذین**

دووبارە شەش یەك بۆ دایكە لە گەڵ دوان یان زیاتر – لە خوشك و برای مردووەكە قیاس بكە سەر دوان زیاتر لە دوان .

باوك[1] و دایك هەموو یەكێكیان شیاوی شەش یەكن لە گەڵ بوونی ئەولادی مردووەكە بە دەقی قورئان كە دەفەرموێ ﴿وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ﴾ سورة النساء الآية ١١.واتە : ود لە بۆ دایك

---

(١) : باوك سێ حاڵەتی بۆ هەیە :

یەكەم : شەش یەك وەردەگرێ لە گەڵ بوونی فەرعی میرات گری نێرینە با بەرەو خوار بڕوات وەك لە سەرەوە بە نمونەوە باسمان كرد .

دووەم : شەش یەك لە گەڵ ماوە وەردەگرێ لە گەڵ بوونی فەرعی میراتگری مێینە كچ و كچی كوڕ هەرچەندە بەرەو خوار بڕوات .

نمونە : پیاوێك مردووە : ژنێك ، دوو كچ و باوك ، كچی كوڕێكی هەیە ، وە بڕی ( ٢٤٠٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| ژن | ٢كچ | كچی كوڕ | باوك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٨}$ | $\frac{٢}{٣}$ | بێ بەش | $\frac{١}{٦}$ +ماوە | ٢٤ |
| ٣ | ١٦ | | ٤+١=٥ | |

٢٤٠٠÷٢٤= ١٠٠ دینار پشكێك . ١٠٠×٣= ٣٠٠ دینار بەشی ژن .

١٠٠×١٦= ١٦٠٠ دینار بەشی دوو خوشك . هەر كچێك ٨٠٠ دیناری دەكەوێ .

١٠٠×٥=٥٠٠ دینار بەشی باوك .

سێهەم : ماوە وەردەگرێ لە كاتی نەبونی فەرعی میرات گر بە گشتی . نمونە : پیاوێك مردووە باوك ، دایك ، چوار براو دوو خوشكی هەیە ، وە بڕی ( ١٠٢) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| دایك | باوك | ٤ برا،٢خوشك | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٦}$ | ماوە | بێ بەش | ٦ |
| ١ | ٥ | | |

١٠٢÷٦=١٧ دینار پشكێك .

١٧×١=١٧ دینار بەشی دایك . ١٧×٥= ٨٥ دینار بەشی باوك .

و باوکی مردووه – هەر یەکێ لەوان – شەش یەکی هەیە لە میراتی مردووەکە ئەگەر نەتەوەی میراتگری ببێت .

نمونە : پیاوێك مردووە : دایك و باوك و کورێك و ژنێکی هەیە وە بڕی(٤٨٠٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| دایك | ژن | باوك | کوڕ | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٨ | ١/٦ | ماوە | ٢٤ |
| ٤ | ٣ | ٤ | ١٣ | |

٤٨٠٠÷٢٤=٢٠٠ دینار پشکێك .

٢٠٠×٤= ٨٠٠ دینار بەشی دایك . ٢٠٠×٣= ٦٠٠ دینار بەشی ژن .

٢٠٠×٤=٨٠٠ دینار بەشی باوك . ٢٠٠×١٣= ٢٦٠٠ دینار بەشی کوڕ .

وە واتای (( ما زال یقفو إثره ویحتذي )) واتە : کورەزا شوێنی کوڕ دەکەوێ و پەیرەوی دەکات لە حوکمەکانیدا .

وە دووبارە شەش یەك بەشی دایکە لە گەڵ دووان یا زیاتر لە خوشك و برا بە گشتی بە ئیجماعی زانایان پێش جیاوازی ئیبن عبباس و جگە ئەویش[1] لە بەر فەرموودەی قورئان دەفەرمویٚ ﴿فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ

---

(١) : پێشەوایانی هەر چوار مەزهەب لە سەر ئەوەن کە دوو برا یان دوو خوشك دایك بێ بەشی ناتەواو دەکەن لە سێ یەکەوە بۆ شەش یەك ، ئیبن عباس بە ئاشکاریی ئەم فەرموودەی خودایە کە دەفەرموێ ﴿فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ﴾سورە النساء الآیة ١١ ، بێ بەشی ناتەواوی ناکات دایك لە سێ یەکەوە بۆ شەش یەك مەگەر کاتێ سێ برا یا زیاتر ببێ ، لە بەر ئەوەی بە ژمارەیە ناوتریٚ کۆ کە کەمتر بێ لە سێ . وە مەعازیش ئەم رایەی هەیە ، ئیبن عباس عەرزی حەزرەتی عوسمانی کرد لە زمانی گەلەکەتدا بە دوو برا (إخوان) ناوتریٚ ((إخوة) براکان چۆن تۆ بە دوو برا دایك بێ بەشی ناتەواو دەکەی لە سێ یەك بۆ شەش یەك ؟ حەزرەتی عوسمان پێی

السُّدُسُ ﴾ سورة النساء الآية ١١ . واته : ئەگەر مردووەکە چەند برایێ یا چەن خوشکێك یا چەند براو خوشکێکی هەبوو ئەوە دایکی ئەو مردووە شەش یەکی ماڵەکەی بۆ هەیە .

| | |
|---|---|
| والجد مثل الاب عند فقده | فـــي حـــوز ما يصبه ومده |

باپیرە وەك باوك وایە لە کاتی نەبوونی باوکدا – لە وەرگرتنی بەشی خۆی و زیاتر ئەگەر تەنیا بوو .

| | |
|---|---|
| الا اذا كـــان هنـــاك اخـــوة | لكونهم في القرب وهوأسوة |

مەگەر کاتێ نەبێ لە گەڵ باپیردا چەند خوشك و برایەك ببێ – لە بەر ئەوەی خوشك و براکان و باپیر لە نزیکدا وەك یەك وان .

| | |
|---|---|
| أو أبـوان معهـمـا وزج ورث | فالأم للثلث مع الـجد تـرث |

مەگەر کاتێ نەبێ دایك و باوکی مردووەکە لەگەڵیا نەبێ مێرد میرات ببا – دایك سێ یەك دەبا لە گەڵ باپیرا .

| | |
|---|---|
| وهكذا ليس شبيها بـالأب | فـــي زوجـــه الميت وام وأب |

هەروەها باپیر مانەند نییە بە باوکەوە – لە مەسەلەی مێردی مردوو و دایك و باوکدا .

| | |
|---|---|
| وحكمه وحكمهـم سيـــأتي | مكمّل البيـــان في الحـــالات |

حوکمی باپیر و حوکمی خوشك و برا کە کۆببنەوە لەمەولا دێ – تەواو کراوی روونکردنەوەیە لە چەند حاڵەتدا .

---

فەرمووی : ناتوانم شتێ بگێڕمەوە و هەڵیوەشێنمەوە کە لە پێش منەوە لە شارەکان رۆیشتون لە سەری و خەڵکی میراتیان بردووە .

فەرموودەکەی حەزرەتی عوسمان ئەوە دەگەیەنێ کە ئیجماعە هاورێکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە سەردەمی حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەر لە سەر ئەوە دامەزراون دوو برایان داناوە لە جێگای سێ دا ، لە گەڵ ئەوەدا عەرەب قەدەغەیان نەکردووە لە وتنی کۆ بە سەر دوودا ، الدرة البهية بتحقيق مباحث الرحبية ص٤٦ .

باپیر[1] لە كاتی نەبوونی باوكدا وەك باوكە لـــــەوەی ( ١/٦ ) وەردەگرێ لە كـاتێ بـوونی فـەرعی میراتگـری نێرینـە بـا بـەرەو خـواریش بـڕوات٢٠ بـە ئیجماع لە بەر ئاشكرایی ئایەتەكە لە بەر ئەوەی باپیر ناودەبرێ بە باوك .

---

(١) : باپیر پێنج حاڵەتی بۆ هەیە :

یەكـەم : شـەش یـەك وەردەگـرێ لـە كـاتی بـونی فـەرعی میراتگـری نیرینـە بـا بـەرەو خواریش بڕوا ، نمونـە : پیاوێك مردووە : دایك و باپیر و سێ برا و چوار خوشكی هەیە ، وە بڕی (٦٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| دایك | باپیر | ٣ برا،٤خوشك | مسئله |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٦}$ | ماوه للذكر مثل حظ الأنثيين | ٦×٥ ٣٠ |
| ١ | ١ | ٤ | |
| ٥ | ٥ | ٢٠ | |

٦٠÷٣٠=٢ دینار پارەی پشكێك .

٢×٥=١٠ دینار بەشی دایك .

٢×٥= ١٠ دینار بەشی باپیر .

٢×٢٠= ٤٠ دینار بەشی براو خوشكەكان .

٤٠÷١٠= ٤ دینار بەشی خوشكێك . ٤×٢ =٨ دینار بەشی برایەك .

دووەم : شەش یەك لە گەڵ ماوە وەردەگرێ لە گەڵ بوونی فـەرعی میراتگـری مێینـە ، نمونە : پیاوێك مردووە دوو كچی كوڕ و باپیر و دایك و دایكـی بـاوكی هەیـە ، وە بڕی (١٢٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| دوو كچی كوڕ | باپیر | دایك | دایكی باوك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{٢}{٣}$ | $\frac{١}{٦}$ + ماوه | $\frac{١}{٦}$ | بێ بەش | ٦ |
| ٤ | ١ | ١ | | |

١٢٠÷٦= ٢٠ دینار پارەی پشكێك . ٢٠×٤= ٨٠ دینار بەشی دوو كچ ، یـەك كچ ٤٠ دیناری بۆ هەیە . ٢٠×١=٢٠ دینار بەشی باپیر . ٢٠×١= ٢٠ دینار بەشی دایك .

فەرمووی (فــي حــوز ما يصبه ومـده) ئاشكراكەی ئەوەیە باپیر وەك باوك وایە لە هەموو حوكمەكاندا هەموو ماڵ وەردەگرێ ئەگەر تاك بێ ، وە ماوە وەردەگــرێ كــاتێ كـە مردووەكـە فـەرعی مـیرات گـری نـەبێ بـەڵام بـاپیر

---

سـێهەم : مـاوە وەردەگـرێ لـە كـاتی نـەبوونی فـەرعی میراتگـر بـە گـشتی ، نمونـە : پیاوێك مـردووە دایك و باپیر ، سـێ بـرای دایكی هەیـە ، وە بـڕی ( ٦٦ ) دینـاری لێ بـە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| دایك | باپیر | ٣ برای دایكی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ماوە | بێ بەش | ٦ |
| ١ | ٥ | | |

٦٦÷٦=١١ دینار پارەی پشكێك .

١١×١= ١١ دینار بەشی دایك .

١١×٥= ٥٥ دینار بەشی باپیر .

چوارەم : بێ بەش دەبێ بە باوك یا بە باپیرێكی دروستی نزیكتر لەو باپیرە لە پلەدا ، نمونـە : پیاوێك مـردووە : دایك و بـاوك و باپیر هەیـە ، وە بڕی ( ٣٣٠ ) دینـاری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| دایك | باوك | باپیر | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٣ | ماوە | بێ بەش | ٣ |
| ١ | ٢ | | |

٣٣٠÷٣= ١١٠ دینار پارەی پشكێك .

١١٠×١= ١١٠ دینار بەشی دایك .

١١٠×٢= ٢٢٠ دینار بەشی باوك .

پێنجـەم : بـاپیر لـە گـەڵ چەند براو خوشكێكدا بـێ ئەمـە مەسـئەلەیەكی جیـاوازە و پێچەوانەی باوكـە لـە بـەر ئەوەیـە كـە خـاوەنی (رحبیـە) جـودای كردووەتـەوە لـە سـێ مەسئەلەدا وەك لە سەرەوە باس كرا .

پێچەوانەی باوکە لە چەند مەسئەلەیکدا لە بەر ئەوەی خاوەنی (رحبیە) باپیری جیاکردووەتەوە لە باوك لە سێ مەسئەلەدا لە مەسئەلەکاندا :

یەکەم : ئەگەر باپیر لە گەڵ چەند برایەکی باوك و دایکی یان باوکیدا بوو حوکمی باپیر لە گەڵیان حوکمی باوکی نییە ، لە بەر ئەوەی باوك براکان بێ بەش دەکات چونکە باوك نزیکترە لە مردووەکە لە براکان وەك لەم مەسئەلەدا هاتووە :

| باوك | دایك | ٤برا و ٢خوشك | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ماوە | ١/٦ | بێ بەشن | ٦ |
| ٥ | ١ | | |

براو خوشکەکەکان بێ بەشن بە بوونی باوك بەڵام لە جیاتی باوکدا باپیر بێت لەم مەسئەلەدا براو خوشکەکان بێ بەش ناکات باپیر دەبێت بە برا بەشیان ، لە بەر ئەوەی براکان یەکسانن لە نزیکی لە مردووەکە وە باپیر و براو خوشکەکان بە هۆی باوکەوە دەگەن بە مردووەکە لە بەر ئەوەیە باپیر دەبێ بە برابەشی براو خوشکەکان،وە لەمەدوا دێت حوکمی هەردوو کیان.

دووەم : یەکێك لە (غراوین) ئەویش باوك و دایك و مێردە

| مێرد | دایك | باوك | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ ماوە | ماوە | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | |

دایك سێ یەکی ماوە وەردەگرێ لە دوای بەشی مێردەکە ($\frac{1}{2}$) دەکات ، وە باوك دوو ئەوەندەی دایك وەردەگرێ .

ئەگەر لە باتی باوك لەم مەسئەلەیەدا باپیر بوایە دایك سێ یەکی ($\frac{1}{3}$) تەواو وەردەگرێ کە دوو بەش لە شەش بەش دەکات وە باپیر یەك بەش وەردەگرێ لە شەش بەش وەك ئەم مەسئەلەیە :

| مێرد | دایك | باوك | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٢ | ١/٣ ماوه | ماوه | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | |

سێهەم : دووەمی مەسەلەی (غراوین) ئەویش باوك و دایك و ژنێك یا زیاتر لە ژنێك .

| ژنێك | دایك | باوك | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٤ | ١/٣ ماوه | ماوه | ١٢ |
| ٣ | ٣ | ٦ | |

لەم مەسەلەدا دایك سێ یەکی ماوە وەردەگرێ لە پاش بەشی چوار یەکی (١/٤) ژنەکە .

ئەگەر لەم مەسەلەدا لە جیاتی باوك باپیر بوایە ، دایك سێ یەکی هەمووی دەکەوت لە ١٢ بەش چواری دەکەوێ وەك ئەم نمونە :

| مێرد | دایك | باپیر | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٤ | ١/٣ | ماوه | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |

باپیر وەك باوك نییە لە وێنەی ئەم سێ مەسەلەدا لە بەر ئەوەی باپیر یەکسان نییە بە باوك لە هاتن بە شوێن مردووەکەدا چونکە بە هۆی باوك دەگات بە مردووەکە .

وبنت الإبن تأخذ السدس إذا كانت مع البنت مثالا يحتذى

شەش یەك وەردەگرێ کچی کوڕ کاتێ – لە گەڵ کچێکی تەنیا بێ ئەمە بکە بە نمونە و پەیرەو کرابێ

وهكذا الأخت مع الأخت التي بالأبوين – يا أخي – أدلت

وە هەروها خوشکێکی باوکی شەش یەك وەردەگرێ لە گەڵ خوشکێکی تەنیای – دایك و بابی بە شوێنیا دێت ئەی برای بچوکم .

چوارەم : تاقم لەوانەی کە شەش یەك بەشیانە : کچی کوڕێك یا زیاتر کاتێ لە گەڵ کچێکی تاك بێ ، ئەو کچی کوڕە یا ئەو کچانی کوڕە کە شەش یەك وەردەگرن تەواو کەری دوو سێ یەکە بە تێکڕای زانایان .

لە بەر فەرموودەی ابن مسعود کە پرسیاری لێ کرا لە بارەی کچێك و کچێکی کوڕ و خوشکێك فەرمووی : حوکمتان بۆ دەکەم بە حوکمی پێغەمبەر ( ﷺ ) نیوە بۆ کچەکە و شەش یەك بۆ کچی کوڕەکە کە تەواو کەری دوو سێ یەکە .

واتە : ئەو کچ و کچی کوڕە دوو سێ یەکی میراتەکە وەردەگرن ، کە دوو سێ یەکی شەش چوار دەکا هەردووکیان وەری دەگرن . وە ئەوەیشی مایەوە بۆ خوشکەکە ، رواه البخاري وغيره . نمونە کەوایە : پیاوێك مردووە کچێك کچی کوڕێك و خوشکێکی هەیە .

| کچ | کچی کوڕ | خوشك | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | ماوە | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | |

فەرموودەی (( مثالا يحتذى)) واتە : تۆ ئەمە بکە بە نمونە و پەیرەوی بکرێ و قیاس بکرێتە سەری هەموو کچی کوڕێك یا زیاتر هاتبێ لە گەڵ کچی کوڕێکی بەرزتر لەو لە رووی پلەوە یا لەوان بۆ کچی کوڕەکە یا بۆ چەند کچێکی کوڕ هەیە شەش یەك لە گەڵ بوونی بەرزتر ئەو کچی کوڕە تەواو کەری دوو سێ یەکە .

واتە : کچە کە نیوە وەردەگرێت وە کچی کوڕەکە شەش یەك وەردەگرێ هەردوکیان دوو سێ یەکی میراتەکە وەردەگرن لەمەوە وەرگیراوە ئەگەر لە گەڵ کچی کوڕەکە دوو کچ یا زیاتر ببێ ئەوە کچی کوڕەکە بێ بەش دەبێ ، وەك ئەم نمونە :

ژنێك مردووه دوو كچ و كچی كوڕێك و خوشكێكی هەیە وە بڕی (٣٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| ٢كچ | كچی كوڕ | خوشك | مسئله |
|---|---|---|---|
| ٢/٣ | بێ بەش | ماوە | ٣ |
| ٢ | | ١ | |

مەگەر كاتێ نەبێ كە كوڕی كوڕێك لە گەڵ كچی كوڕەكە بێ ئەوە دەیكا بە عەصەبە ، نمونە : پیاوێك مردووە : ژنێك و دوو كچ و كوڕی كوڕی كوڕ و كچی كوڕێك و باوكی هەیە .

| ژن | ٢كچی | كچی كوڕ كوڕی كوڕی كوڕ | باوك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ٢/٣ | ماوە | ١/٦ | ٣ × ٢٤<br>٧٢ |
| ٣ | ١٦ | ١ | ٤ | |
| ٩ | ٤٨ | ٣ | ١٢ | |

پێنجەم :تاقم لەوانەی شەش یەك وەردەگرن : خوشكی باوكی یا چەند خوشكێكی باوكی لە گەڵیانا بێ خوشكێكی تەنیایی باوك و دایكی ، نمونە : پیاوێك مردووە : خوشكێكی باوك و دایكی و خوشكێكی باوكی و دایك و ژن و باپیر ، وە بڕی (١٩٥) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەكرێت بە سەریاندا ؟

| خوشكی دایك و باوكی | خوشكی باوكی | دایك | ژن | باپیر | مسئله |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ | ١/٤ | ١/٦ | ١٢<br>بەرزدەگرێتەوە بۆ ١٥ |
| ٦ | ٢ | ٢ | ٣ | ٢ | |

١٩٥÷١٥=١٣ دینار پارەی پشكێك

١٣×٦= ٧٨ دینار بەشی خوشكی باوكی و دایكی .

١٣×٢=٢٦ دینار بەشی خوشكی باوكی . ١٣×٢=٢٦ دینار بەشی دایك .

١٣×٣=٣٩ دینار بەشی ژن . ١٣×٢= ٢٦ دینار بەشی باپیر .

بیٚ گومان شەش بۆ خوشكی باوكییە كە تەواو كەری دوو سیٚ یەكە بە تیٚكڕایـی زانایـان و قیـاس كردنـە سـەر پیٚـشەوە ، ئەگـەر دوو خوشـك یـا زیـاتری بـاوك و دایكـی لـە گـەڵ بـوو ئـەوە خوشـكە باوكییەكـە یـان چـەند خوشـكییە باوكیەكـە بـیٚ بـەش دەبـن ، نمونـە : پیـاویٚ: مـردووە : دوو خوشكی باوك و دایكی و دوو ژن و دوو خوشكی باوك و دایكی هەیە .

| ٢خوشكی دایك و باوكی | ٢خوشكی باوكی | دایك | ٢ ژن | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{٢}{٣}$ | بێ بەش | $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٤}$ | ١٢ |
| ٨ | | ٢ | ٣ | بەرزدەكرێتەوە بۆ ١٢ |

مەگەر كاتیٚ نەبیٚ برایان لە گەڵ بیٚ كە بیكا یان بیانكات بە عەصەبە ، نمونە : پیاویٚ: مردووە : دوو خوشكی باوك و دایكی ، خوشك و برایەكی بـاوكی هەیـە ، وە بڕی (٧٢) دینـاری لیٚ بە جـیٚ مـاوە ، ئایـا چـۆن دابـەش دەكریٚت بە سەریاندا ؟

| ٢خوشكی دایك و باوكی | دایك | خوشكی باوكی ، برایەكی باوكی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{٢}{٣}$ | $\frac{١}{٦}$ | ماوەللذكر مثل حظ الأنثيين | |
| ٤ | ١ | ١ | |

٧٢÷٦=١٢ دینار پارەی پشكیٚك .

١٢×٤=٤٨ دینار بەشی دوو خوشكی باوكی و دایكی .

١٢×١= ١٢ دینار بەشی دایك .

١٢×١=١٢ دینـار بەشـی خوشك و بـرا ، دوو بەشـی بـۆ بـرای باوكیـە كـە هەشت دینارە وە چوار دیناری بۆ خوشكی باوكییە .

**والسدس فرض جدة في النسب      واحـــدة كانـت لأم أو أب**

شەش یەك بەشی نەنكە لە رشتەدا – یەیكیٚك یا زیـاتر بـیٚ لـە لای دأیكـە وە بیٚ یا باوك .

## وولد الأم ينال السدسا          والشرط في إفراده لا ينسى

ئـەولادی دایـك نێـر بـێ یـا مـێ شـەش یـەك وەردەگـرێ – مەرجـە تـاکی ئەولادی دایك با لە یاد نەچێ .

<u>شەشەم</u> تاقم لەوانەی شەش یەك وەردەگرن : نەنکە بە گشتی یەکسانە مردووەکە برای ببێ یان نەبێ وە یەکسانە نەنك لە لایەن دایکەوە بێ یا لە لایەن باوکەوە بێ وە دایکی دایکی دایکی باوك و دایکیان میرات دەبەن هەموو یەکێك لەوانە شەش یەك وەردەگرن کاتێ تاك بن ، وە هاوبەشن لە شەش یەکدا کاتێ کۆببنەوە بە تێکڕای زاناکان ، وە دایکی باپیرە و دایکیان لای ئێمە و زانایانی ئیمامی حەنەفی ، لە بەر ئەوەی ئەمانە بە دوایانا هاتووە میرات بەر قیاس دەکرێتە سەر دایکی باوك بە پێچەوانەوە بۆ ئیمامی مالك ئەگەر بە دوایانا نەهات میرات میرات بەر میرات نابا وەك دایکی باوکی دایك .

نمونە : پیاوێ مردووە : دایکی دایکی دایك ، وە دایکی باوکی باوك ، وە دایکی دایکی باوك ، وە دایکی باوکی دایك ، وە کچ و کچی کوڕ و برای باوکی ، و دوو خوشکی باوکی هەیە . وە بڕی ( ٣٧٨) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| دایکی دایکی دایك | دایکی باوکی باوك | دایکی دایکی باوك | دایکی باوکی دایك | کچ | کچی کوڕ | برای دایکی | ٢ خوشکی باوکی | مسئله |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| شەریکن لە شەش یەکدا | | | بێ بەش | $\frac{١}{٢}$ | $\frac{١}{٦}$ | بێ بەش | ماوە | ٦ |
| ١ | | | | ٣ | ١ | | ١ | |

٣٧٨÷٦=٦٣ دینار پارەی پشکێك . ٦٣×١=٦٣ دینار بەشی سێ ئەنك .

٦٣÷٣=٢١ بەشی یەك نەنك .   ٦٣×٣=١٨٩ دینار بەشی کچ .

٦٣×١=٦٣ دینار بەشی دوو خوشکی باوکی . ٦٣÷٢= ٣١,٥ بەشی یەك خوشك . ٦٣×١=٦٣ دینار بەشی کچی کوڕ .

حەوتەم تاقم لەوانەی کە شەش یەك بەشیانە : ئەولادی دایکی نێر بێ یان مێ بێ بە مەرجی ئەوەی تاك بێ لای تێکڕای زانایان لە بەر فەرموودەی خودای گەورە ﴿ وله أخ أو أخت فلكل واحد منها السدس ﴾ سوره النسا و الآيه ١٢ . واتە ئەو پیاوە برایەکی دایکی یا خوشکێکی دایکی هەبوو ئەوە هەریەکێ لەو خوشك و برایە شەش یەکی ماڵی مردووەکە دەبەن ، نمونە : پیاوێ: مردووە برایەکی دایکی و خوشکی باوکی و خوشکی باوك و دایکی هەیە ، وە بڕی ( ١٨٠) دیناری لێ بە جێ ماوە ، ئایا چۆن دابەش دەکرێت بە سەریاندا ؟

| برایەکی دایکی | خوشکی باوك و دایك | خوشکی باوکی | دایك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٢ | بێ بەش | ١/٦ | ٦ |
| ١ | ٣ | | ١ | |

١٨٠÷٦=٣٠ دینار پارەی پشکێك .

٣٠×١=٣٠ دینار بەشی برای دایکی .

٣٠×٣=٩٠ دینار بەشی خوشکی باوك و دایکی .

٣٠×١=٣٠ دینار بەشی خوشکی باوکی .

٣٠×١=٣٠ دینار بەشی دایك .

وان تساوى نسب الجدّات وكنّ كلهنّ وارثات

ئەگەر رشتەی نەنکەکان یەکسان بوون – بێ بەشیان تیا نەبوو هەموویان میرات بەر بوون :

فالسدس بينهنّ بالسّويّة في القسمة العادلة الشرعية

بەشیان شەش یەکەبە یەکسانی لە نێوانیانا – لەدابەش کردنێکی دادپەروەری شەرعیدا ئەگەر مردووەیەك دوو نەنك یان چەند نەنکێکی هەبوو وە یەکسان بوون رشتەیان لە پلەدا وە هەموویان میرات بەر بوون

وەك دایكی دایكی دایك و دایكی دایكی باوك و دایكی باوكی باوك شەش یەك دابەش دەكرێ بە سەریاندا وەك لە نمونەی پێشودا رابورد .

بەراستی پێغەمبەر (ﷺ) (( قضى للجد بين الميرات بالسدس )) رواه الحاكم على شرط الشيخين . واتە : حوكمی كردووە بۆ دوو نەنك بە شەش یەك لە میراتدا ، قیاس كراوەتە سەر دوان زیاتر .

ئیمامی احمد ریوایەتی كردووە كە پێغەمبەر (ﷺ) (( ورث ثلاث جدات)) رواه ابو داود في مراسيله ، واتە : میراتی داوە بە سێ نەنك .

خاوەنی (رحبية) بۆ ئەم حدیسە ئاماژەی كردووە بە فەرموودەی (العادلة الشرعية ) .

ئەگەر یەكێك لەو دوو نەنكە یان ئەو نەنكانە لە دوو رووەوە دەگەیشتن بە مردووەكە وە جگە ئەویش لە یەك رووەوە دەگەیشت بە مردووەكە شەش یەك دابەش دەكرێت بە سەریاندا بە یەكسانی لە سەر فەرموودەی راستر .

وإن تكنْ قربى لأم حجبت أم اب بُعدى وسدسا سلبت

ئەگەر نەنكێ:ی دایكی نزیك بوو بێ بەشی دەكات - دایكی باوكی دور وە بە تنیا شەش یەك وەردەگرێت .

وإن تكن بالعكس فالقولان في كتب اهل العلم منصوصان

ئەگەر بە پێچەوانەی پێشەوە بوو دوو فەرموودە تیایا باس كراوە — لە پەرتووكەكانی ئەهلی عیلمدا دوو دەق هەیە بۆ ئیمامی شافیعی .

لا تسقط البعدى على الصحيح واتفق الجلّ على التصحيح

نەنكی دوور لە لای دایكییەوە بێ بەش نابێ بە نەنكی نزیك لە لای باوكییەوە — یەكن كۆمەڵێكی زۆر لە لای زانایانی شافیعی و مالیكی لە سەر راستی فەرموودەی یەكەم .

ئەگەر رشتەی دوو نەنك جیاواز بوو یان كۆمەڵە نەنكێ لە پلە و روودا — بەم شێوە هەندێكیان نزیك تر بن لە مردووەكە لە هەندێكیان وەك ئەوە

نەنكێكی نزیك لای دایك وە نەنكێكی دوری لای باوك بێ وەك دایكی دایك و دایكی دایكی باوك یا دایكی باپیر لای ئێمە نەنكی نزیك دایك و باوكی نەنكی دوری باوكی بێ بەش دەكات وە بە تەنها شەش یەك وەردەگرێ وە ئەوە مەبەستە لە فەرمودەی (حجبت أم اب بعدي وسدسا سلبت ) .

ئەگەر مەسەلە كە پێچەوانە بوو بەم شێوە نەنكێكی نزیك لە لایەنی باوكەوە بێ وە نەنكێكی دوریش لە لایەن دایكەوە بێ وەك دایكی باوك و دایكی دایكی دایك ئەوە دوو فەرموودەی ئیمامی شافیعی تیایە وە وتراوە دوو وەجهی تێدایە راستترینیان ئەوەیە نەنكێكی دوور لە لای دایكەوە بێ بەش نابێ بە نەنكێكی نزیك لە لای باوكەوە بەڵكو هەردووكیان هاوبەشن لە شەش یەكدا چونكە لای دایكی ئەصلە دوورەكە چارەسەر دەكا وە بەمە بڕیاریان داوە زانایانی ئیمامی مالیكی .

فەرموودەی دووەم بێ بەش دەبێ نەنكی دوور لە لای دایكەوە بە نەنكی نزیك لای باوكەوە بەمە بڕیاریان داوە زانایانی ئیمامی حەنەفی لە بەر دووری نەنكی دایك .

وكلَ من أدلتْ بغير وارث　　　فما لها حظ من الموارث

هەموو نەنكێ كە هاتبێ بۆ لای مردووەكە بە میرات نەبردن – ئەوە بەشی نییە لە میراتدا چونكە لە (ذي الأرحام) ە .

وتسقط البعدى بذات القرب　　　في المذهب الأولى ، فقلْ لي : حسبي

نەنكی دوور بێ بەش دەبێ بە نەنكی نزیك – لە مەزهەبی پەسەندترا بڵێ : بە من بەسمە .

هەموو نەنكێك بێت بۆ لای مردوو لە ڕێگایەكەوە كە میرات وەرنەگرێ وەك دایكی باوكی دایك كە میرات گر نییە ئەوەی بێ بەش دەبێ و هیچ بە شێكی نییە لە میراتدا چونكە لە (ذي الأرحاكم ) ە ئەگەر نەنكی نزیك و

دوور میرات بەربوون لە لای دایکەوە وەك دایکی دایك و دایکی دایکی دایك یان هەردووکیان لە لای باوکەوە بوون وەك دایکی باوك و دایکی دایکی باوك وە دایکی باوك و دایکی باپیر ئەوە دوورەکە بە نزیکەکە بێ بەش دەبێ لای ئێمە لەم دوو وێنەدا بە بێ پێچەوانە .

ئەگەر دوو نەنکەکە لە لای باوکەوە بوو نەنکی نزیك لای باوکی باوکەوە بوو وە نەنکی دوور لای دایکی باوکەوە بوو وەك دایکی باوکی باوك ، وە دایکی دایکی باوك هەندێ لە هاورێیانی ئێمە دوو فەرموودە پێشووەکەیان فەرمووە تیایاندا وە هەندێکیشیان بڕیاریان داوە کە نزیکەکە دوورەکە بێ بەش دەکات وە ئەوە مەزهەبی ڕاستترە ، لە ڕاستیدا وانییە ، وە ئەم جیاوازییە دەخرێتە سەر وێنە کۆتاییەکە کە دایکی باوك و دایکی نەنکە .

وقد تناهت قسمة الفروض          من غير إشكال ولا غموض

بێ گومان دابەش کردنی بەشەکان و خاوەنەکانیان کۆتای هات – بە بێ ئەوەی تەنگ و چەڵەمە و پەنامەکی تێدابێ .

## إمثلة ذكر حلّها وتعليلها

## چەند نمونەیەك باسكرابێ راهێنان و هۆكارەكانی

(١) پیاوێك مردووه : كوڕ ، باوكی هەیە .

| باوك | كوڕ | مسئله |
|---|---|---|
| $\frac{١}{٦}$ | ماوه | ٦ |
| ١ | ٥ | |

بۆ باوك لەم نمونەیەدا شەش یەك ($\frac{١}{٦}$) وەردەگرێ چونكە كاتێ كوڕی مردووی لە گەڵیا بێ تەنها بە بەش میرات وەردەگرێ ، وە ئەوەی دەمێنێتەوە كوڕەكە وەری دەگرێ لە بەر ئەوەی عەصەبەیە وە نزیكترین كەسە لە عەصەبەدا وەلە پایەی عاصیبە كە هەموو ماوە وەرگرێ.

(٢) ژنێك مردووه : مێرد و كوڕ و باوكێكی هەیە .

| مێرد | كوڕ | باوك | مسئله |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٤}$ | ماوه | $\frac{١}{٦}$ | ١٢ |
| ٣ | ٧ | ٢ | |

مێرد لەم نمونەیەدا شیاوی چوار یەكە ($\frac{١}{٤}$) لە بەرئەوەی لە گەڵ ئەولادی مردووەكە یا كوڕە زایا بێ ئەو بەشە وەردەگرێ ، وە باوك تەنها شەش یەك ($\frac{١}{٦}$) وەردەگرێ چونكە فەرعی میراتگر نێرینەیە ، وە ئەوەی دەمێنێتەوە كە ($\frac{٧}{١٢}$) كوڕەكە وەری دەگرێ .

(٣) پیاوێك مردووه : باوك و كچێكی هەیە .

| كچ | باوك | مسئله |
|---|---|---|
| $\frac{١}{٢}$ | $\frac{١}{٦}$ +ماوه | ١٢ |
| ٣ | ٣=٢+١ | |

كچ لەم نمونەدا نیوە ($\frac{١}{٢}$) وەردەگرێ لە بەر ئەوەی لە خاوەن بەشەكانە وە كەسیشی لە گەڵ نییە بیكا بە عەصەبە ، وە باوك شەش یەك ($\frac{١}{٦}$) ی

میراتەکە وەردەگرێ لە پاشا ئەوەی دەمێنێتەوە باوکەکە بە عەصەبە وەری دەرگرێ کە سێ یەکی میراتەکەیە وە بەشی باوک لەم میراتەدا دەبێتە نیوەی ماڵەکەیە .

(٤) ژنێ: مردووە : مێرد و کچ و باوکێکی هەیە .

| مێرد | کچ | باوک | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٤}$ | $\frac{١}{٢}$ | $\frac{١}{٦}$ +ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٦ | ٣=٢+١ | |

مێردەکە چواریەك ($\frac{١}{٤}$) وەردەگرێ لە بەر ئەوەی فەرعی میراتبەری لە گەلێدایە کە کچەکەیە ، وە کچەکە نیوە ($\frac{١}{٢}$) ی میراتەکە وەردەگرێ ، وە باوکەکە شەش یەك ($\frac{١}{٦}$) وەردەگرێ بە بەش وە ئەوەی دەمێنێتەوە لەم نمونەدا کە( $\frac{١}{١٢}$ ) باوك وەری دەگرێ بە عەصەبە بەشی باوك دەبێ بە ($\frac{١}{٤}$) چوار یەك لەم نمونەیەدا .

(٥) پیاوێ: مردووە : کوڕێك و باوك و باوکی باوك و ژنێکی هەیە .

| ژن | باوك | باوکی باوك | کوڕ | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٨}$ | $\frac{١}{٦}$ | بێ بەش | ماوە | ٢٤ |
| ٣ | ٤ | | ١٧ | |

ژنەکە هەشت یەك ( $\frac{١}{٨}$) وەردەگرێ لە بەر ئەوەی فەرعی میراتبەر کە کوڕە هەیە ، وە باوك شەش یەك ( $\frac{١}{٦}$) وەردەگرێ لە بەر ئەوەی فەرعی میراتبەر کە کوڕە هەیە ، باوکی باوك بێ بەش دەبێ بە بوبونی باوك ، وە کوڕەکە ماوەی ماڵەکە وەردەگرێ کە ( $\frac{١٧}{٢٤}$) ی ئەمە مەسەلەیە چونکە نزیکترین عەصەبەیە وە کەسیش بێ بەشی ناکات .

## أمثلة يطلب حلها وتعليلها

## چەند نموونەیە داواکراوە ڕاهێنان و هۆکارەکانی

(أ) باسی بەشی هەموو میرات بەرێ بکە لەم پرسیارانەدا کە دێت ؟

(١) پیاوێك مردووە : کچێك و باپیری هەیە .

| کچ | باپیر | مسئله |
|---|---|---|
| $\frac{١}{٢}$ | $\frac{١}{٦}$+ماوە | ٦ |
| ٣ | ٢+١=٣ | |

کچ لێرەدا نیوە وەردەگرێ بە بەش لە بەر ئەوەی کەس نییە بیکات بە عەصەبە ، وە باپیر شەش یەك ( $\frac{١}{٦}$) وەردەگرێ بە بەش وە ئەوەی ماوەتەوە بۆ باپیرە لە بەر ئەوەی فەرعی میرات بەر کچە ، کەواتە باپیر نیوەی میراتەکە وەردەگرێ لەم نموونەدا .

(٢) ژنێك مردووە : مێرد و کچێك و باپیری هەیە :

| مێرد | کچ | باپیر | مسئله |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٤}$ | $\frac{١}{٢}$ | $\frac{١}{٦}$+ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٦ | ٢+١=٣ | |

مێرد چوار یەك ( $\frac{١}{٤}$) وەردەگرێ لە بەۆ ئەوەی فەرعی میراتگر لە گەڵیدایە ، کچ نیوە ( $\frac{١}{٢}$) وەردەگرێ لە بەر هۆی پێشوو ، وە باپیر شەش یەك ($\frac{١}{٦}$) لە گەڵ ماوە وەردەگرێ وەك نموونەی پێشوو .

(٣) پیاوێك مردووە : ژنێك و کچ و کوڕێکی هەیە :

| ژن | کچ و کوڕ | مسئله |
|---|---|---|
| $\frac{١}{٨}$ | ماوە | ٨×٣ |
| | | ٢٤ |
| ١ | ٧ | |
| ٣ | ٢١ | |

لەبەر ئەوەی(٧)پێشەکی کچ و کوڕەکەیە دابەش ناکرێت بە سەریاندا ٨×٣ کە ئەصلی مەسەلەکەیە دەکەین دەکاتە ٢٤ .

٢١÷٣=٧ بەشی کچ .

٧×٢=١٤ بەشی کوڕ . کچەکە کوڕەکە دەکات بە عەصەبە ماوە دەبەن لە پاش بەشی ژنەکە .

(٤) پیاوێك مردووە : ژنێك و کچێك و کچی کوڕێك و باپیری هەیە :

| ژن | کچ | کچی کوڕ | باپیر | مسئله |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١/٨ | ١/٢ | ١/٦ | ١/٦+ماوە | ٢٤ |
| ٣ | ١٢ | ٤ | ٤+١=٥ | |

ژنەکە هەشت یەك (١/٨) وەردەگرێ ، وە کچ نیوە (١/٢) وەردەگرێ ، وە کچی کوڕەکە شەش یەك (١/٦) وەردەگرێ لە بەر ئەوەی لە گەڵ کچدایە ، باپیر شەش یەك (١/٦) و ماوە وەردەگرێ .

(٥) ژنێك مردووە : دایك ، باوك ، مێرد :

| مێرد | دایك | باوك | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٢ | ١/٣ ماوە | ماوە | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | |

ئەم مەسەلەیە پێی دەڵێن (غراوین) مێردەکە نیوە (١/٢) وەردەگرێ لەبەر نەبوونی فەرعی میراتگر ، دایك سێ یەك (١/٣) ماوە وەردەگرێ لە پاش بەشی مێرد باوك ماوە وەردەگرێ لە بەر نەبوونی فەرعی میراتگر بە گشتی.

(ب) میرات گران و بێ بەشان روونکەرەوە لەم پرسیارانەی کە دێن ؟ :

(١) پیاوێك مردووە : ژنێك ، باوك ، باوکی باوك ، دایکی دایك ، کچ ، کچی کوڕێکی هەیە :

| ژن | کچ | کچی کوڕ | باوك | باوکی باوك | دایکی دایك | مسئله |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ١/٨ | ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ +ماوە | بێ بەش | ١/٦ | ٢٤ بەرزدەبێتەوە بۆ |
| ٣ | ١٢ | ٤ | ٤ | | ٤ | ٢٧ |

هەموو یەکێك لە ژن و کچ و کچی کوڕ و باوك و دایکی دایك خاوەن بەشن وە باوکی باوك بێ بەش دەبێ بە باوك لە بەر ئەوەی نزیکترە لە مردووەکە.

(٢) پیاوێك مردووه : کچێك و باپیر و برایەکی دایکی هەیە :

| کچ | باپیر | برای دایکی | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| $\frac{١}{٢}$ | $\frac{١}{٦}$ ماوه | بێ بەش | ٦ |
| ٣ | ٣=٢+١ | | |

کچ نیوە وەردەگرێ لەم نمونەیەدا ، باپیر شەش یەك لە گەڵ ماوە وەردەگرێ وەك لە سەرەوە روونمان کردەوە ، برای دایکی بێ بەش دەبێ بە باپیر و کچەکە چونکە هەرکام لە باپیر و کچ بێ ئەولادی دایك بێ بەش دەکات .

(٢) ژنێك مردووه : مێرد و کچ و کوڕ و باوکێکی هەیە :

| مێرد | باوك | کچ وکور | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| $\frac{١}{٤}$ | $\frac{١}{٦}$ | ماوه | ١٢×٣= ٣٦ |
| ٣×٣ ٩ | ٢×٣= ٦ | ٧×٣= ٢١ | |

وەك مەسەلەی سێهەمی پێشووە٧ دابەش ناکرێت بە سەر کچ و کوڕەکەدا ١٢× ٣ = ٣٦

مێرد چوار یەك ($\frac{١}{٤}$) وەردەگرێ لە بوونی فەرعی میرات گر کە کوڕ و کچەکەیە ، وە باوك شەش یەك ($\frac{١}{٦}$) وەردەگرێ لە بوونی فەرعی میرات گری نێرینە کە کوڕە ؛ وە کچ و کوڕەکە ماوە وەردەگرن لە بەر ئەوەی کچەکە بە هۆی کوڕەکەوە بووە بە عەصەبە .

(ج) لە هەموو مەسەلەیە لەم مەسەلانەدا کە دێت کۆمەڵێك میرات گرن و کۆمەڵێك بێ بەشن روونیان بکەرەوە : ؟

(١) پیاوێك مردووه : باوك ، باوکی باوك ، برایەکی دایکی هەیە .

| باوك | باوکی باوك | برای دایکی | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| هەموو ماڵەکە | بێ بەش | بێ بەش | ١ |
| ١ | | | |

باوك هەموو ماڵەكەی دەكەوێ لە بەر ئەوەی (عصبة بنفسه) یە . وە باوكی باوك و برای دایكی بێ بەش دەبن بە باوك ، وە هەروەها برای دایكی بە باوكی باوكیش بێ بەش دەبێت .

(٢) ژنێك مردووە : مێرد ، باوك ، باوكی دایك ، باوكی باوك ، برایەكی دایكی هەیە .

| مێرد | باوك | باوكی دایك | باوك باوك | برای دایك | مسئله |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە | بێ بەش | بێ بەش | بێ بەش | ٦ |
| ٣ | ٣ | | | | |

مێرد نیوە وەردەگرێ لە بەر نەبوونی فەرعی میراتگر . وە باوك ماوە وەردەگرێ لە بەر نەبوونی فەرعی میراتگر .

(٣) پیاوێك مردووە باوك ، كوڕ ، برایەكی دایكی هەیە .

| باوك | كوڕ | برای دایكی | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ماوە | بێ بەش | ٦ |
| | ٥ | | |

باوك شەش یەك ($\frac{1}{6}$) وەردەگرێ ، وە كوڕەكە ماوە وەردەگرێ چونكە عەصەبەیە ، وە برای دایكی بێ بەش بوو بە بوونی باوك هەروەها بە كوڕ .

(٤) ژنێكی ئازاد كراو مردووە : مێرد ، كوڕێك . باوك . برایەكی‌دایكی هەیە :

| مێرد | كوڕ | باوك | برای دایك | كوڕی گەورەكەی | مسئله |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ماوە | ١/٦ | بێ بەش | بێ بەش | ١٢ |
| ٣ | ٧ | ٢ | | | |

مێرد چوار یەك ($\frac{1}{4}$) وەردەگرێ بە هۆی بوونی فەرعی میرات بەر كە كوڕەكەیە ، وە باوك شەش یەك ($\frac{1}{6}$) وەردەرێ بە هۆی بوونی فەرعی میرات

بەری نێر کە کوڕەکەیە ، وبرای دایکی بیٚ بەش بووە بە هۆی باوك ، وە کوڕی گەورەکەی بیٚ بەش بوو بە هۆی کوڕی مردووەکە و باوکی .

(٥) پیاوێکی ئازادکراو مردووە : کوڕ و کچێك و باوك و گەورەکەی کە ئازادی کردووە هەیەتی .

| باوك | کوڕ و کچ | گەورەکەی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | ماوە | بیٚ بەش | ٣×٦ |
| | | | ١٨ |
| ٣×١ | ٣×٥ | | |
| ٣ | ١٥ | | |

باوك شەش یەك ( $\frac{1}{6}$ ) وەردەگریٚ بە هۆی بوونی فەرعی میرات کە کوڕ و کچەکەیە ، وەکوڕ و کچەکە ماوەی دوای بەشی باوك هەمووی دەبەن ، وە گەورەی مردووەکە بیٚ بەش بووە بە هۆی بوونی کوڕ و کچ .

(٦) ژنێکی ئازاد کراو مردووە مێرد ، کوڕ وکچێکی خۆی ، کوڕ و کچیٚ:ی گەورەکەی هەیە .

| مێرد | کوڕوکچ | کوڕوکچی گەورەکەی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | ماوە | بیٚ بەش | ٤ |
| ١ | ٣ | | |

مێرد چوار یەك ( $\frac{1}{4}$ ) وەردەگریٚ بە هۆی بوونی فەرعی میرات گر کە کوڕ و کچەکەیە ، کوڕو کچی گەورەکەی بیٚ بەش بە هۆی بوونی فەرعی میرات گر کە کوڕوکچەکەیە .

(٧) ژنێکی ئازاد کراو مردووە : مێرد ، کورو کچی گەورەکەی کە ئازادی کردووە ، خوشکێکی باوکی و دایکی گەورەکەی هەیە .

| مێرد | کوڕی گەورەکەی | کچی گەورەکەی | خوشکی گەورەکەی | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | ماوە | بیٚ بەش | بیٚ بەش | ٢ |
| ١ | ١ | | | |

مێـرد نیـوه ($\frac{1}{2}$) وەردەگـرێ لـە بـەر نـەبوونی فـەرعی میراتگـر ، کـوڕی گەورەکـەی مـاوه وەردەگـرێ چـونکه عەصـەبەیه ، وه کـچی گەورەکـەی و خوشکی گەورەکەی بێ بەشن .

(٨) پیاوێ: مردووه برا و دوو خوشکی دایکی و کوری مامێکی هەیە .

| براو دوو خوشکی دایکی | کوڕێ مام | مسئله |
|---|---|---|
| $\frac{١}{٢}$ | ماوه | ٣×٣ |
| | | ٩ |
| ٣=٣×١ | ٦=٣×٢ | |

برا و دوو خوشکی دایکی سێ یـەك ($\frac{1}{3}$) وەردەگرێ چونکه ژمارەیـان لـە یەکێ زیاتره وه کورێ مام ماوه وەردەگرێ چونکه عەصەبەیه .

(٩) ژنێك مردووه : مێرد و سێ برای دایکی و کچێکی مامی هەیە .

| مێرد | ٣برای دایکی | کچی مام | مسئله |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٢}$ | $\frac{١}{٣}$ | بێ بەش | ٦ |
| ٣ | ٣=١+٢ | | |

پشکێك دەمێنێتەوه دەگەرێتەوه بۆ ٣براکه پشکەکەیان دەکاتـە سـێ یـەك ($\frac{1}{3}$) یەکێ پیشکێکیان دەکەوێ .

(د) لـەم مەسـەلانەی دێـت میرات بـەرێ یـا زیـاتر هەیـە جیـاوازن لـە میرات وەرگرتنەکەیانـدا روونـی بکـەرەوە هـەموو مەسـەلەیه کـێ مـیرات دەبـات بـه ئیجماع وه کێ میرات نابات به ئیجماع .

وه کامیان زاناکان جیاوازیان هەیه لە میرات بردنیا . وه روونـی کـەرەوه لـەم جـۆرەی ئـەخیر چـۆن میراتەکـه دابـەش دەکـرێ لـه سـەر هـەردوو راوبووچونەکه ئەوەی دەڵێت میرات دەبات و ئەوەی دەڵێت میرات نابات .

(١) پیاوێ: مردووە : دایك و كچێك كە لە ژیانی خۆیا ئیقراری كردووە بە كچێەتی .

| دایك | كچ | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٢ | بێ بەش | ٦ |
| ١+٢=٣ | دووی دەمێنێتەوە دەگەڕێتەوە بۆ دایك | |

(٢) پیاوێك مردووە دایك و كچێكی و برایەك كە لە ژیانی خۆیدا ئیقراری كردووە پێی وە سابت نەبوو ئەو برایە بە پێی ئەم ئیقرارە .

| كچ | دایك | برا | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | هیچ وەرناگری | ٦ |
| ٣ | ١ | دوو تیرە دەمێنێتەوە دەگەڕێتەوە بۆیان | |

(٣) پیاوێك مردووە : ژنێك و برایەك كە لە ژیانی خۆیدا ئقراری كردووە پێی ، وە سابت نەبووە ئەو برایەتییە بە بێ ئەم ئیقرارە .

| ژن | برا | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٤ | هیچ وەرناگری | ٤ |
| ١ | | ٣ تیرە دەمێنێتەوە دەگەڕێتەوە بۆ ذی الأرحام یان بیت المال |

(٤) پیاوێ: مردووە برایەكی هەیە كە سابتە نەسەبی ، وە برایەكی تریش كە لە ژیانی خۆیا ئیقراری كردووە پێی ، وە سابت نەبووە ئەوە برایەتی بە بێ ئەو ئیقرارە .

| برایی نەسەب | برا ئیقرار | مسئله |
|---|---|---|
| هەموو ماڵەكە دەبات | هیچ وەرناگری | ١ |
| ١ | | |

(٥) پیاوێك مردووه : کور و کچێکی هەیە ، وە لە ژیانی خۆیا ئیقراری کردووە بۆ ژنێك کە ژنیەتی ، وە لەشەرعدا قەدەغە نییە لە دروستی ئەم ئیقرارە .

| ژن | کوڕ و کچ | مسئله |
|---|---|---|
| ١ | ماوە | ٣×٨ |
| ٨ | للذكر مثل حظ الأنثيين | ٢٤ |
| ١ | ٧ | |
| ٣ | ٢١ | - ٧ بۆ کچ ، ١٤ بۆ کوڕ |

(٦) ژنێك مردووه : کوڕێك و مێردێك کە لە ژیانیدا ئیقراری کردووە کە ئەو پیاوە مێردییەتی شەرع قەدەغەی دروستی ئەو ئیقرارە ناکان .

| کوڕ | مێرد | مسئله |
|---|---|---|
| ماوە | ١ | ٤ |
| | ٤ | |
| ٣ | ١ | |

(٧) پیاوێ: مردووه : خوشکێکی دایك و باوکی ، دایك ، کوڕی کوڕێك کە لە ژیانیدا ئیقراری کردووە کە ئەوە کوڕی کوڕیەتی .

| دایك | خوشك | کوڕی کوڕ | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١ | ١ | هیچ وەرناگرێ | ٦ |
| ٣ | ٢ | | دەگەڕێتەوە |
| ٢ | ٣ | | ٥ |

# باب التعصيب [1]

(١) وشەی (عصبة) لە زمانی عەرەبیدا خزمی پیاوە لە لایەن باوکەوە وە لە زاراوەی شەرعدا : کەسێکە شیاوی هەموو ئەو ماڵە بێت کاتێ تاك بێت وە ئەگەر خاوەن بەش بوو وەری بگرێ ئەوەی مایەوە لە خاوەن بەشەکان ، وە کاتێ نەمایەوە بێ بەش دەبێت هیچ شت وەرناگرێ .

وشەی (عصبة) یا ناوی رەگەزییە دەوترێ بۆ ژمارەیەك و چەند ژمارەیەك وە بۆ نێر و مێ یان کۆی (عاصب) ە وەکو ( طالب ، طلبة ) بەڵام زاناکانی شەرع بە کاریان هێناوە بۆ یەك کەس چونکە ئەو تاکە کەسە لە جێگای کۆمەڵێکدایە لە وەرگرتنی هەموو ماڵەکە .

عصبە : دوو بەشە :

یەکەم : عصبة بالنفس) .

دووەم : (عصبة بالنسب) .

وە عصبة النسبية : دابەش دەکرێ بۆ سێ بەش :

<u>یەکەم</u> : عصبة بنفسە : واتە : هەموو نێرێکی رشتەیی کە نەبێت لە نێوان ئەو و مردووە کەدا نێرینەیەك ، وەکو : کوڕ و کوڕێ کوڕ ، وە باوك و باوکی باوك ، برای باوك و دایکی برای باوکی ، کوڕی برای باوك و دایکی و کوڕی برای باوکی ، مامی باوك و دایکی ، مامی باوکی ، کوڕێ مامی باوك و دایکی ، کوڕی مامی باوکی .

<u>دووەم</u> : عصبة بغیرە : واتە : هەموو مێینەیەکی خاوەن بەش کاتێ کە برای لە گەڵ بێ وەك چەند کچێ یا کچێ لە گەڵ کوڕ یا کچی کوڕ لە گەڵ کوڕی کوڕ .

<u>سێهەم</u> : عصبة مع الغیر : واتە هەموو مێینەیەکە کە دەبێ بە عەصەبە بە کۆبوونەوەی لە گەڵ غەیری خۆیدا ئەوە خوشکی باوك و دایکیە یا خوشکی باوکیە لە گەڵ کچدا یا لە گەڵ کچی کوڕدا .

وە بەڵگەشمان لە سەر میرات وەردەگرن بە عەصەبە بە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) خودای گەورە دەفەرموێ : ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾النساء/١١ ، وە هەروەها خودای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَإِن كَانُوا إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾ النساء/١٧٦ . وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : (( ألحقوا الفرائض بأهلها فما بقي فهو لأولى رجل ذكر )) رواه البخاري (٦٣٥١ ) في الفرائض ،

**كالأب ، والجد ، وجدّ الجد　　　والإبن عند قربه والبُعد**

عاصب بنفسه ئەوەیە : باوك و باپیر و باپیری باپیر – وە کوڕ لە کاتی نزیکی و دووریدا .

**والأخ والـإبنُ الأخ والأعمام　　　والسيّد المعتق ذي الأنعام**

براو کوڕی برا ، مامەکانی باوك و دایکی یا باوکی – وە گەورەی ئازادکاری خاوەن بەخشش .

**وهكـــذا بنوهـم جميـعا　　　فكن لمـــا أذكـــره سمـــيعا**

وە هەروەها کوڕەکانی مامەکان و ئازادکاران با بڕۆن بەرەو خوار – ئەوەی بۆت باس دەکەم گوێ رایەڵ بە .

عاصب بنفسه : ئەوەیە : باوك و باپیر ، و باوکی باپیر ، با بەرەو ژوور بڕوا ، ئەوە مەبەستە بە فەرموودەی (رحبية) ((وجد الجد ) واتە : باپیری باپیر ، وە کوڕ و کوڕی کوڕ با بڕوا بەرەوخوار ئەوە مەبەستە بە فەرموودەی (عند قربه والبعد ) واتە : لە کاتی نزیکی و دووری کوڕدا ، وە برای دایك و باوکی ، یا برای باوکی ، وە کوڕی برای باوك و دایکی ، و کوڕی برای باوکی ، ، وە مامی باوك و دایکی ، یا مامی باوکی ، یا کوڕ مامی باوك و دایکی یا کوڕی مامی باوکی ، ئەوە مەبەستە بە (الأعمام) واتە : مامەکان ، وە ئازادکار : نێر بێ یا مێ ، وە عەصەبەی ئازدکار بە نەفسی هی .

وە فەرموودەی ( وهكـذا بنـوهم جميعـا ) واتـە : هـەروەها هـەموو کوڕەکانیان : واتە : کوڕی مامی باوك و دایکی ، و کوڕی مامی باوکی ، وە کوڕی ئازادکار . ئەوە جۆرێ لە کەم و کوڕی تێدایە ، چونکە هەر باسی کوڕی ئازادکاری کردووە و بێ دەنگ بووە لەوانی تر لە عەصەبە کە عەصەبەن بە خۆیان .

هەموو یەکێك لەم عەصەبانەی باسکران هەموو ماڵ وەردەگرن ئەگەر تاك بن وەری دەگرن ماوە ئەوەی زیاد بێ لە بەشەکان ئەگەر لەم مەسئەلەدا خاوەن بەشێ یا زیاتری تیابێ بە فەرموودەی تێکڕای زاناکان لە بەر

فەرموودەی خودای گەورە ﴿وَهُوَ يَرِثُهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلَدٌ﴾ سورة النساء آية ١٧٦ ، واتە : ئەو کەسەش میرات دەبات لەو خوشکی خۆیە واتە : هەمخوو ماڵەکە دەبات ئەگەر ئەو ژنە منداڵی نەبێت .

وە لە بەر تێگەیشتن لە بەر فەرموودەی خودای گەورە ﴿وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ﴾ سورة النساء آية ١١ . واتە : میراتەکە وەردەگرن دایك و باوکی مردووەکە دایکەکە لەو میراتە ($\frac{1}{3}$) سێ یەك ، وە ($\frac{2}{3}$) دوو لە سەر سێ دەمێنێتەوە بۆ باوکەکەی ، واتە باوکی مردووەکە ماوە وەردەگرێ .

وە لە بەر فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) (( الحقوا بألها فما بقي فلأولى رجل ذكر )) متفق عليه .

وما الذي البعدى مع القريب　　　　في الإرث من حظ ولا نصيب

نییە بۆ میرات بەری خاوەن پلەی دوور لە گەڵ میراتبەری پلەی نزیك لە میراتدا لە بەش .

والأخ و العم لأم وأب　　　　أولى من المدلي بشطر النسب

براو مامی دایك و باوکی – شیاوترە لە میرات وەرگرتن لەوەی بە یەك لا بێ لە رشتە .

پێش کەوت ئەو کەسەی بە تەنها هەموو ماڵی وەردەگرت یان ئەوەی لە خاوەن بەشەکان بمایەتەوە وەری دەگرت .

وە لەم دوو دێڕەدا حوکمی ئەوانە باس دەکات ئەگەر دوان یا زیاتر لە عەصەبە کۆبوونەوە لە یەك رووەوە ئەگەر هەندێکیان نزیکتر بوون لە مردووەکە لە هەندێکی تریان ئەوە نزیکەکە دوورەکە بێ بەش دەکات وە بەش نییە بۆ دوورەکە وەمیرات وەرگرتن بۆ نزیکەکەیە ، کوڕ کوڕی کوڕ بێ بەش دەکات ، وە هەموو کوڕی کوڕێ ئەو کوڕی کوڕانەی کە لە خواری خۆیەوە بن بێ بەشی دەکات ئەمەش لە بەر نزیکییە ، باوك باپیر بێ بەش دەکات ، وە هەروەها باپیرێ ئەو باپیرانەی لە سەری خۆیەوەیەتی بێ بەشی

دەكات . وە مام كوڕی مام بێ بەش دەكات ، وە هەموو كوڕی براو و كوڕی مامێ ئەوەی لە خواری خۆیانەوە بن بێ بەشی دەكەن ، وە هەموو ئەمانەش بە تێكاری زاناكانە .

ئەو دوو عەصەبە یا زیاتر یەكسان بن لە نزیكیدا ، وە ئەگەر یەك بن لە روویەكی تەنهاوە لە پلەدا ، ئەوە سەیر بكە : ئەگەر هەندێكیان دەگەیشتن بە مردووەكە لە لای باوك و دایكەوە وە ئەوی تریان هەر بە باوك دەگەیشت بە مردووەكە ، ئەوەی دایك و باوكی بێ پێشترە بە میرات وەرگرتن لەوەی هەر بە باوكی بێ بە تێكڕای زاناكان .

ئەوە مەبەستە لە دێری دووەمدا میرات بۆ باوك و دایكی تەنهایە ، ئەمەش لە براو و كڕی براو و كوڕی مامدا بە هەمان شێوەیە .

وەرگیراوە لەم فەرموودەوە ئەگەر هەمووان یەسكان بوون لە پلەدا بۆ لای مردووەكە وەك ئەوەی هەموویان باوك و دایكی بوون یا باوكی بوون ، لێردا هەندێكیان لە پێشتر نین لە هەندێكیان بەڵكو هەموویان هاوبەشن لە میراتدا بە یەكسانی .

هەروەها ئەمەش بە تێكڕای زاناكانە وەك كوڕەكان و كوڕی كوڕەكان ، وە لەیرەدا باسی ئەوانەی نەكرد كە جیاوازن لە رووی عەصەبەكەیاندا ، وە هەندێكیان لەمەودوا باس دەكرێن لە (حجب) دا .

وە رووەكانی عەصەبە : شەش بەشە : كوڕ و كوڕی كوڕ و باوك و باپیر باوكی باوك ، و براو كوڕی برا ، و مامە لە پاشا ولاء واتە ئەو خاوەنە كە بەندەكەی ئازاد كردووە ئەگەر مردووەكە كۆنە بەندە بوو وە میرات گری شەرعیش نەبوو .

**والإبن والأخ مع الإناث يعصباتهنّ في الميراث**

كوڕ و برا لە گەڵ مێینەدا یەكێك بێ یا زیاتر – دەیان كەن بە عەصەبە لە میراتدا .

**والأخوات إن تكن بنات　　　فهن معهن معصبات**

وە خوشکێ یا زیاتر لە خوشکێ ئەگەر کچێ یا زیاتر لە کچێ دەست کەوت -- ئەو خوشکانە لە گەڵ کچەکاندا دەبن بە عەصەبە

**وليس في النساء طرا عصبة　　　إلاَ التي منّت بعتق الرقبة**

هەرگیز لە ناو ژناندا نییە عەصەبە — جگە ئەو مێینە نەبێ کە خاوەن نیعمەت بێ بە ئازاد کردنی گەردنی بەندەکەی لە بەر رەزامەندی خودا . ئەگەر ئەو بەندە مردوو سامانێکی هەبوو وە کەسی میراتگری شەرعی نەبوو ئەو کاتە ئازادکاری پیاو یا ژن میراتی لێ دەبا .

لە کاتێکدا لێبوویەوە لە باسکرنی ( عصبة بنفسه ) ی دەستی کرد بە (عصبة بغيره ) ی و (عصبة مع غيره ) ی .

(عصبة بغيره ) ی چوارن : کچ ، کچی کوڕ ، خوشکی باوك و دایکی ، خوشکی باوکی ، کوڕێك یا زیاتر کچێ یا زیاتر هەبێ دەیکەن بە عەصەبە هەروەك ئەوەی کوڕی کوڕێ یا زیاتر کچی کوڕێ یا زیاتر لە پلەی ئەودابێ دەیکەن بە عەصەبە وە برای دایك و باوکی یەك بێ یا زیاتر خوشکی دایك و باوکییەك یا زیاتر دەیکەن بە عەصەبە ، وە برای باوکی خوشکی باوکی دەیکا بە عەصەبە ئەوە مەبەستە بە فەرموودەی ( الإبن والأخ مع البنات - يعصباتهن في الميراث ) کوڕ کوڕی کوڕی رشتەیی وە کوڕی کوڕی راستی مەجازی دەگرێتەوە وە لە سەر فەرموودەی راستتر ، وە برا برای دایك و باوکی وە برای باوکی دەگرێتەوە .

وە مەبەست بە کوڕ و برا رەگەزەکەیەتی تا تاك و کۆیان بگرێتەوە .

وە فەرموودەی ( مع الإناث ) واتە لە گەڵ کچەکاندا و کچانی کوڕ و خوشکەکان کە یەکسان بن لە نزیکیدا .

هەموو یەکێك لەو کوڕ و برانە ئەو مێنگینانە کە یەکسانن لە گەڵیان لە نزیکی و هاتن بە شوێن مردووەکەدا دەیان کەن بە عەصەبە .

بەڵام بۆ هەر نێرێك بەشی دوو مێینە هەیە بە تێكڕای زاناكان لە بەر فەرموودەی خودای گەورە (يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ ۞ سورة النساء آية ١١ .

بزانە : كوڕی كوڕ چۆن خوشكی خۆی و كچی مامی كە لە پلەی ئەودا بێ دەیكات بە عەصەبە هەروەها كوڕی كوڕ دەیكا بە عەصەبە كچی كوڕ لە سەرووی خۆیەوە ئەگەر بەشی نەبێ بەم شێوەی لە سەریەوە بێ لە كچان یا لە كچانی كوڕ یا لەو دوانە ئەوەی دووسێ یەك وەردەگرێ .

وە (عصبة بغیره ) خوشكێكە یا زیاتر باوك و دایكی بێ یا باوكی لە گەڵ كچێك یا كچی كوڕێك یا زیاتر بن ، واتای ئەوەیە بۆ كچێ یا كچی كوڕێك نیوە وەردەگرێت ، وە چەند كچێك یا چەند كچی كوڕێ دوو سێ یەك وەردەگرن ، وە ئەوەی زیاد بوو بۆ خوشكێ یا چەند خوشكێ بە یەكسانی وەری دەگرن لە بەر فەرموودەی ابن عباس و مسعود كە رابورد وە ئەوە واتای فەرموودەی دوو بەشە (( الأخوات مع البنات عصبات )) چەند خوشكێ لە گەڵ چەند كچێ عەصەبەن .

وە لە كتێبی (إعانة الطالبین ) ٢٢٨/٣ دا هاتووە (( ومعنی أنّ الأخت لأبوین أو لأب مع البنت أو بنت الإبن عصبة )) واتە : بەراستی خوشكی باوك و دایكی یا باوكی لە گەڵ كچدا یا لە گەڵ كچی كوڕدا عەصەبەن ، وەك ئەوەی پیاوێك مردووە ژنێك و كچێك و كچی كوڕێك و دایك و خوشكی باوك و دایكی هەیە .

| ژن | كچ | كچی كوڕ | دایك | خوشك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ | ماوە | ٢٤ |
| ٣ | ١٢ | ٤ | ٤ | ١ | |

هەروەها لە كتێبی (مغنی المحتاج) ١٩/٣ دا هاتووە كە بوخاری ریوایەتی كردووە پرسیار كرا لە ئیبن عباس و مسعود لە بارەی

## أمثلة ذكر حلها وتعليلها

### چەند نمونەیە راهێنان و هۆكارەكانی باس كرابێت

(١) پیاوێك مردووە : ژنێك و دوو كچ و باوك و دایكی هەیە :

| ژن | ٢كچ | باوك | دایك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ٢/٣ | ١/٦ +ماوە | ١/٦ | ٢٤ بەرزدەبێـەوە بۆ ٢٧ |
| ٣ | ١٦ | ٤ | ٤ | |

ژن و دوو كچ و دایكەكە لە خاوەن بەشەكانن ، وە باوكیش لە وێنەی ئەم مەسئەلەدا میرات وەردەگرێ بە بەش و بە عەصەبە ئەگەر بۆی بمێنێتەوە چونكە مردووەكە كچی هەیە و كوڕێ نییە .

ژنەكە (١/٨) هەشت یەك وەردەگرێ ، وە دوو كچەكە (٢/٣) دوو سێ یەك وەردەگرن ، وە دایك (١/٦) شەش یەك وەردەگرێ ، وە باوك (١/٦) شەش یەك وەردەگرێ وە هیچ نەمایەوە تا باوك بە تەعصیب وەری بگرێ ، بەڵكو بەشەكان زیاترن لە كۆمەڵی میراتەكە ، بەرزدەبێتەوە لە ٢٤ بۆ ٢٧ .

(٢) ژنێك مردووە : باوك ، مێرد ، دوو كچی هەیە :

| مێرد | ٢كچی | باوك | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ٢/٣ | ١/٦ +ماوە | ١٢ بەرزدەبێـەوە بۆ ١٣ |
| ٣ | ٨ | ٢ | |

مێرد و دوو كچەكە لە خاوەن بەشەكانن ، وە باوك لەم وێنەیەدا میرات وەردەگرێ بە بەش لە پاشا بە تەعصیب ئەگەر بۆی بمێنێتەوە .

مێرد (١/٤) چواریەك وەردەگرێ ، وە دوو كچەكە (٢/٣) دوو سێ یەك وەردەگرن ، وە باوك بەشی خۆی (١/٦) شەش یەكە وەری دەگرێ ، هیچ نەمایەوە تا باوك بە تەعصیب وەری بگرێ ، بەڵكو بەشەكان زیاترن لە كۆمەڵی میراتەكە ، مەسئەلەكە بەرزدەبێتەوە لە ١٢ بۆ ١٣ .

(٣) پیاوێك مردووه : ژنیّ ، باوك ، دوو كچ و كچی كوڕێك ز كوڕی كوڕێكی هەیە :

| ژن | ٢ كچ | باوك | كچی كوڕ و كوڕی كوڕ | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٨}$ | $\frac{٢}{٣}$ | $\frac{١}{٦}$ | ماوه للذكر مثل حظ الأنثيين | ٢٤×٣= ٧٢ |
| ٣ | ١٦ | ٤ | ١ | |
| ٣×٣= ٩ | ١٦×٣= ٤٨ | ٤×٣= ١٢ | ١×٣= ٣ | |

ژن و باوك و دوو كچەكە لە خاوەن بەشەكانن ، كچی كوڕ و كوڕی كوڕ لە عەصەبەی رشتەیین ، كوڕی كوڕ (عصبة بنفسه ) یە ، وە كچی كوڕ (عصبة لغیره) یە .

ژن ($\frac{١}{٨}$) هەشت یەك وەردەگریّ ، باوك ($\frac{١}{٦}$) شەش یەك وەردەگریّ ، دوو كچەكە ($\frac{٢}{٣}$ ) دوو سیّ یەك وەردەگرن ، ئەوەی بمێنێتەوە لە پاش ئەم بەشانە كە ($\frac{١}{٢٤}$) ی كۆمەڵی میراتەكەیە دابەش دەكریّ بە سەر كوڕی كوڕ و كچی كوڕەكەدا وە كوڕی كوڕەكە دوو ئەوەندەی كچی كوڕەكەی دەكەوێت ، جا لە بەر ئەوەی یەك ناكرێت بە سیّ بەشەوە كە دوو بەشی بۆ كوڕی كوڕەكە بیّ و بەشێكی بۆ كچی كوڕەكە بیّ ، كوڕەكە بە دوو كەس دادەنرێت و كچەكە بە یەك دادەنریّ دەكاتە سیّ ، ئەو سیّ كەرەتی ٢٤ دەكەین دەكاتە ٧٢ واتە ٣×٢٤=٧٢ لەو ٧٢ سیّ تیریان دەكەویّ دوو بەشی بۆ كوڕی كوڕەكە و بەشێكی بۆ كچی كوڕەكە .

(٤) پیاوێك ئازاد كراو مردووه : ژنێك و برایەكی دایكی و گەورەكەی كە ئازادی كردووه هەیەتی :

| ژن | برای دایكی | گەورەكەی | مسئله |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٤}$ | $\frac{١}{٦}$ | ماوه | ١٢ |
| ٣ | ٢ | ٧ | |

ژن و برای دایکی له خاوەن بەشەکانن ، گەورەی ئازادکار لە عەصەبەی سەبەبیە لێرەدا ژن ($\frac{1}{4}$) چواریەك بەشیەتی وەری دەگریّ ، برای دایکی ($\frac{1}{6}$) شەش یەك وەردەگریّ ، وە ئەوەی کە مایەوە لە پاش بەشەکان هی ئازاد کارەکەیە کە ۷ بەشە لە ۱۲ واتە : ($\frac{7}{12}$) دەکات .

(٥) ژنێك: مردووە : مێرد و دایك و دوو کچ و گەورەکەی کە ئازادی کردووە هەیەتی :

| مێرد | دایك | ٢کچ | گەورەکەی | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{2}{3}$ | ماوە<br>هیچ نەمایەوە | ١٢ بەرز بوویەوە بۆ١٣ |
| ٣ | ٢ | ٨ | | |

مێرد و دایك و دوو کچەکە لە خاوەن بەشەکانن ، گەورەکەی ئازادکار لە عەصەبەی سەبەبیە ، مێرد ($\frac{1}{4}$) چواریەك وەردەگریّ ، دایك ($\frac{1}{6}$) شەش یەك وەر دەگریّ ، دوو کچەکە ($\frac{2}{3}$)دوو سیّ یەك وەردەگرن ، هیچ نەمایەوە تا ئازادکارەکە وەری بگریّ بەڵکو ئەم مەسئلەیە بەرز دەکرێتەوە لە (١٢) ەوە بۆ (١٣) ە .

## تمرينات يطلب حلها

## چەند راهێنانێ شی کردنەوەی داواکراوە

(أ) باسی بەشی هەموو میرات گرێ بکە لە سەرجەم ئەم مەسئەلانەدا ؟

(١) ژنێك مردووە مێرد ، و سێ کچ و کوڕی کوڕێك و نەنکێکی هەیە :

| مێرد | ٣کچ | کوڕی کوڕ | نەنك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ٢/٣ | ماوە | ١/٦ | ١٢ بەرز بوویەوە بۆ١٣ |
| | | لم يبق شيء | | ٣٩=٣×١٣ |
| ٣ | ٨ | | ٢ | |
| ٩=٣×٣ | ٢٤=٣×٨ | | ٦=٣×٢ | |

لە بەر ئەوەی کە بەشی سێ کچەکە دابەش نابێ بە سەریاندا دێن ژمارەی کچەکان کەرەتی ئەصلی مەسئەلەکە کە (١٣) دەیکەین دەبێت بە (٣٩) ، سێ کچەکە (٢٤) دەکەوێ کە یەکێ (٨) یان دەکەوێ بە بێ کەرت .

(٢) ژنێك مردووە : مێرد دوو کچ و کوڕی کوڕێك و نەنکێکی هەیە :

| مێرد | ٢کچ | کوڕی کوڕ | نەنك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ٢/٣ | ماوە | ١/٦ | ١٢ بەرز بوویەوە بۆ١٣ |
| | | لم يبق شيء | | |
| ٣ | ٨ | | ٢ | |

(٣) پیاوێك مردووە : کوڕی کوڕێك و باوك و دایکی هەیە :

| باوك | دایك | کوڕی کوڕ | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٦ | ماوە | ٦ |
| ١ | ١ | ٤ | |

(٤) پیاوێك مردووە : ژنێك و ٢کچ و دایك و کوڕی کوڕی کوڕێکی هەیە :

| ژن | ٢کچ | دایك | کوڕی کوڕ کوڕ | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ٢/٣ | ١/٦ | ماوە | ٢٤ |
| ٣ | ١٦ | ٤ | ١ | |

(٥) پیاوێك مردووه : دایك وكچێك و كوڕی كوڕێكی هەیە :

| كچ | دایك | كوڕی كوڕ | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ماوه | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | |

(٦) ژنێك مردووه : مێرد و باوك و دایكی هەیە :

| مێرد | دایك | باوك | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ ماوه | ماوه | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | |

لێرەدا دایك (١/٣) سێ یەكی ماوه وەردەگرێ واتە : لە پاش ئەوەی مێردەكە بەشی خۆی وەرگرت كە سێ یە لە شەش . وە سێ ی دەمێنێتەوە لەو شەشە ، لەو سێ یە كە ماوەتەوە سێ یەكی دەدرێ بە دایك وە ئەوی تری دەمێنێتەوە كە دوو بەشە بۆ باوكە .

(٧) پیاوێك مردووه : ژنێك و دایك ، و سێ براودوو خوشكی دایكی و لە هەمان كاتدا براكانی كوڕی مامینی :

| مێرد | دایك | ٣برا و ٢ خوشكی دایكی | ٢كوڕی مام | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ١/٣ | ماوه | ١٢ ×٥=٦٠ |
| ٣ | ٢ | ٤ | ٣ | |
| ١٥ | ١٠ | ٢٠ | ١٥ | |

(٨) پیاوێك مردووه : ژنێك و باوك و دایك و سێ كچ و سێ برا و خوشكێكی هەیە وە ٢٧١٧٥ دیناری لە دوا بە جێ ماوه ئایا یەكی چەندیان دەكەوێ ؟

| ژنێك | باوك | دایك | ٣كچ | ٣برا ١خوشك | مسئله |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ١/٦ +ماوه | ١/٦ | ٢/٣ | بێ بەش | ٢٤ بەرز بوویەوە بۆ ٢٧ ×٣= ٨١ |
| ٣ | ٤ | ٤ | ١٦ | | |
| ٩ | ١٢ | ١٢ | ٤٨ | | |

١٧٥ ٢٧ ÷ ٨١ = ٣٣٥ دینار بەشی یەك تیر .

٣٣٥ × ١٢ = ٤٠٦٨ دینار بەشی باوك . ٩×٣٣٥ = ٣٠٥١ دینار بەشی ژن . ٣٣٥ × ١٢= ٤٠٦٨ دینار بەشی دایك .

٣٣٥× ٤٨ = ١٦٢٧٢ دینار بەشی ٣ کچ ، هەر کچێکیان ٥٤٢٤ دیناری دەکەوێ .

(ب) روونی بکەرەوە ئەوەی میرات دەبات ، وە ئەوەی تەنها میرات بە بەش دەبات لە گەلْ روونکردنەوەی بەشە دانراوەکەی ، وە ئەوەی بە تەعصیب میرات دەبات ، وە ئەوەی بە بەش و تەعصیب میرات دەبات ، لە هەموو مەسئلەە لەم مەسئەلانەی خوارەوە ؟

(١) ژنێك مردووە : مێرد و دایك و باوك و دوو کچی هەیە :

| مێرد | ٢کچ | دایك | باوك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ٢/٣ | ١/٦ | ١/٦ +ماوە | ١٢ بەرز بوویەوە بۆ ١٥ |
| ٣ | ٨ | ٢ | ٢ | |

باوك لەیرەدا بەش و ماوەی بۆ هەیە چونکە فەرعی میرات گری مردووەکە تەنها کچە ، وە ماوەی بۆ نەماوەتەوە .

(٢) ژنێك مردووە : باوك ، و کچێك و کچی کورێك و نەنكی هەیە :

| کچ | کچی کور | باوك | نەنك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ +ماوە | ١/٦ | ٦ |
| ٣ | ١ | ١ | ١ | |

(٣) پیاوێ: مردووە : مێرد و باوك و دایك و دوو کچی هەیە :

| ژن | ٢کچ | باوك | دایك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ٢/٣ | ١/٦ +ماوە | ١/٦ | ٢٤ بەرز بوویەوە بۆ ٢٧ |
| ٣ | ١٦ | ٤ | ٤ | |

(٤) ژنێك مردووە: مێرد و کچ وبرایەکی باوك، خوشکی باوکی و دایکی :

| مێرد | کچ | خوشك باوك و دایك | برای باوکی | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١/٤ | ١/٢ | ماوە | بێبەش | ٤ |
| ١ | ٢ | ١ | | |

(٥) ژنێك مردووە : مێرد و دایك و دوو برای باوکی و دوو مامی باوك و دایکی هەیە :

| مێرد | دایك | ٢برای باوك | ٢مام | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١/٢ | ١/٦ | ماوە | بێ بەش | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | | |

لێرەدا بەمام بێ بەش بووە بە برای باوکی .

(٦) پیاوێك مردووە : کچێك و کچێکی کوڕێك و دوو خوشکی باوك و دایکی هەیە .:

| کچ | کچی کوڕ | ٢خوشك | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٢ | ١/٦ | ماوە | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | |

(٧) پیاوێك مردووە : ژنێك و دایك و چوار خوشك و برایەکی دایك و باوکی و برایەکی دایکی و خوشکێکی باوکی هەیە ، وە بڕی ( ٧٢) هەزار دیناری لە دوا بە جێ ماوە ئایا هەریەکەیان چەندیان دەکەوێ ؟

| ژن | دایك | ٤خوشك و برایەك | برای دایکی | خوشکی باوکی | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ١/٤ | ١/٦ | ماوە | ١/٦ | بێ بەش | ١٢×٦<br>٧٢ |
| ٣ | ٢ | ٥ | ٢ | | |
| ١٨ | ١٢ | ٣٠ | ١٢ | | |

٧٢٠٠٠÷٧٢= ١٠٠٠ دینار بەشی تیرێك .

١٠٠٠× ١٨ = ١٨٠٠٠ دینار بەشی ژن .

۱۰۰۰× ۱۲ = ۱۲۰۰۰ دینار بەشی دایك .

۱۰۰۰×۱۲ = ۱۲۰۰۰ دینار بەشی برای دایکی

۱۰۰۰×۳= ۳۰۰۰۰ دینار بۆ چوار خوشك و براکە

۳۰۰۰۰ ÷ ٥ = ٥۰۰ دینار بەشی یەك خوشك

٥۰۰×۲=۱۰۰۰ دینار بۆ براکە

(ج) روونی بکەرەوە عەصەبە و جۆرەکەی وە خاوەن بەشەکان وەبەشی هەموو یەکێکیان لە هەموو مەسئەلەیە لەم مەسئەلانەی خوارەوە :

(۱) ژنێك مردووە : مێرد و کچی کوڕێك و خوشکی باوك و دایکی برایەکی باوکی هەیە :

| مێرد | کچی کور | خوشکی باوك و دایکی | برای دایکی | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ۱/٤ | ۱/۲ | ماوە | بێ بەش | ٤ |
| ۱ | ۲ | ۱ | | |

(۲) پیاوێك مردووە : ژنێك و دایك و سێ کچ و کوڕێکی هەیە :

| ژن | دایك | ۳کچ و کوڕێك | مسئله |
|---|---|---|---|
| ۱/٤ | ۱/٦ | ماوە | ۲٤ ×٥= ۱۲۰ |
| ٥×۳ | ٥×٤ | ٥×۱۷ | |
| ۱٥ | ۲۰ | ۸٥ | |

کچێك = ۱۷ وەردەگرێ ، کوڕەکە = ۳٤ وەردەگرێ . کچ (عصبة بغیه) ە ، وە کور (عصبة بنفسه) ە .

(۳)پیاوێك مردووە باوك ، کچ و کچی کوڕێك و نەنك دایکی دایکی هەیە:

| کچ | کچی کور | باوك | نەنك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ۱/۲ | ۱/٦ | ۱/٦+ماوە | ۱/٦ | ٦ |
| ۳ | ۱ | ۱ | ۱ | |

(٤) ژنێ: مردووە مێرد و برایەك و سێ خوشكی باوك و دایكی هەیە :

| مێرد | برا و ٣ خوشك | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە | ٢×٥= |
| | للذكر مثل حظ الأنثيين | ١٠ |
| ١×٥ | ١×٥ | |
| ٥ | ٥ | |

براكە (عصبە بنفسە) ٥ ، خوشكەكان (عصبە بغيرە ) ٥ .

(٥) پیاوێكی ئازاد كراو مردووە : ژنێك: و دایك و مامی گەورەكەی كە ئازادی كردووە هەیەتی :

| ژن | دایك | مامی گەورەكەی | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |

(٦) پیاوێكی ئازادكراو مردووە : برایەكی دایكی و باپیری گەورەكەی و برای گەورەكەی لە لای باوكییەوە هەیە :

| برای دایكی | باپیری گەورەكەی | برای گەورەكەی | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٦ | ماوە | ٦ |
| ١ | ١ | ٤ | |

(٧) ژنێكی ئازاد كراو مردووە :مێرد و خوشكی باوك و دایكی گەورەكەی و كوڕی ئازادكارەكەی هەیە :

| مێرد | خوشكی دایكی | باوكی گەورەكەی | كوڕی گەورەكەی | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ | ماوە | ٦ |
| ٣ | ١ | ١ | ١ | |

(٨) پیاویٚ: مردووه : ژنێك و ٥كور و دوو كچی هەیە :

| ژن | ٥كوڕ و دوو كچ | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٨ | ماوه للذكر مثل حظ الأنثيين | ٨ ×١٢ ٩٦ |
| ١ | ٧ | |
| ١٢ | ٨٤ | |

بۆ كوڕێك = ١٤ ، بۆ كچێك = ٧ .

(٩) پیاوێك مردووه : دایك و ٥ كوڕ و دوو كچی هەیە :

| دایك | ٥كوڕ و دوو كچ | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٦ | ماوه للذكر مثل حظ الأنثيين | ٦×١٢ ٧٢ |
| ١ | ٥ | |
| ١٢ | ٦٠ | |

بۆ كوڕێك = ١٠ ، بۆ كچێك ٥ .

(١٠) پیاوێك مردووه : ژنێك و ٦كوڕ دوو كچی هەیە :

| ژن | ٦كوڕ و دوو كچ | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٨ | ماوه للذكر مثل حظ الأنثيين | ٨×٢ ١٦ |
| ١ | ٧ | |
| ٢ | ١٤÷١٤ = ١ | |

كچێك = ١ كوڕێك = ٢

# باب الحجب

## باسی حەجب بەربەست کردن دەکات

حەجب لە زمانی عەرەبیدا بە واتای : بەربەست کردنە ، وە لە شەرعدا بەربەست کردنە لە میرات بە تەواوی یا لە هەندێکی .

(حەجب) بەربەست دوو جۆرە :

یەکەم : بەبەستی ناتەواو (حجب النقصان) وەك :

گەرانەوەی مێرد بە هۆی منداڵەوە لە ($\frac{1}{2}$) نیوە بۆ ($\frac{1}{4}$) چواریەك .

وە ژن ($\frac{1}{4}$) چوار یەك بۆ ($\frac{1}{8}$) هەشت یەك .

وە دایك لە ($\frac{1}{3}$) سێ یەك بۆ ($\frac{1}{6}$) شەش یەك .

وە باوك لە هەمووی میرات بۆ ($\frac{1}{6}$) شەش یەك [1].

---

١ بەربەستی ناتەواو (حجب النقصان) دابەش دەکرێت بە چەند بەشێکی زۆر بەڵام سیانیان زۆر بەناوبانگە :

یەکەم : گەرانەوە بە هۆی میراتگرەوە لە بەشێکی زۆر بۆ بەشێکی کەم ، ئەمەش لە پێنج کەسدایە : مێرد و ژن و دایك ، کچی کوڕ و خوشکی باوك .

دووەم : گەرانەوە لە میرات وەرگرتن بە بەش بۆ میرات وەرگرتن بۆ تەعصیب ، چوار میرات گرە لە ئافرەتاندا ، کچ و کچی کوڕ و خوشکی باوك و دایکی ، خوشکی باوکی .

سێیەم : گەرانەوە لە میرات وەرگرتن بە تەعصیب بۆ میرات وەرگرتن بە بەش ، ئەمەش دوو میراتگرە لە پیاواندا : باوك و باپیر .

ئەم بەربەستی ناتەواوە (حجب النقصان ) دەکەوێتە سەر (نۆ) کەس لە میراتگران : مێرد ، ژن ، دایك ، باوك ، باپیر ، کچ ، کچی کوڕ ، خوشکی باوك و دایکی ، خوشکی باوکی .

دووەم : بەبەستی تەواو (حجب الحرمان ) وەك بەربەست كردنی كوڕی برا لە میرات وەرگرتن بە هۆی براوە [1].

**والجد محجوب عن الميـراث          بالأب في أحـــــواله الثلاث**

باپیر لە میرات بێ بەش كراوە – لە هەرسێ حاڵەكەی بە هۆی باوكەوە

**وتسقط الجدات من كل جهة          بالأم فافهمه وقس ما أشبهه**

نەنكـەكان بـێ بـەش دەبـن لـە هـەموو روویەكـەوە – بـە دایـك ، تێبگـە قیاس بكە ئەوەی وەك ئەوە .

**وهكذا ابن الابن بالابـن فلا          تبغ عن الحكم الصحيح معدلا**

هەروەهایـە كـوڕی كـوڕ بـێ بـەش دەبـێ بـە كـوڕ – داوا مەكـە لادان لـە حوكمی راستی .

**وتسقط الإخــوة بالبنــينا          وبالأب الأدنى كمــا رويــنا**

براكان بێ بەش دەبن بە كوڕەكان – وە باوكی نزیك وەك گێرامانەوە .

باپیر بـێ بـەش دەبـێ بە باوك بـە گـشتی ، یەكسانە كـە بـاپیر مـیرات وەرگرێ بە تەعصیب بە تەنها وەك ئەوەی كەسـی لـە گـەڵ نـەبێ ، یـا میرات وەرگرێ بە بەشی تەنها وەك ئەوەی باپیر كوڕی مردووەكەی لە گەڵ بێ ، یا بە بەش و تەعصیب وەریگرێ وەك ئەوەی كچی لە گەڵدا بێ ، باپیر لەم سێ

---

(١) بەربەستی تەواو (حجب الحرمان) لـە هـەموو میرات گراندا روونادات بـەڵكو لـە هەندێكدا دێتە جێ ، ئەوانەی هـەرگیز بەربەستی تـەواو روویـان تـێ ناكـات شەشـن لـە میراتگراندا : ( باوك ، دایك ، ژن ، مێرد ، كوڕ ، كچ ) .

ئەوانەی بەربەستی تەواو دەكەوێتە سەریان نۆزدە میراتگرن : : كـوڕی كـوڕ ، كـچی كوڕ ، باپیر ، نەنك دایكی دایك ، نەنك دایكی باوك ، برای دایك و باوكی ، برای بـاوكی ، برای دایكی ، خوشكی باوك و دایكی ، خوشـكی بـاوكی ، خوشـكی دایكـی ، كـوڕی برای باوك و دایكی ، كوڕی برای باوكی ، مامی باوك و دایكی ، مـامی بـاوكی ، كـوڕی مامی باوك و دایكی ، كوڕی مامی باوكی ، گەورەی ئازاد كـار (پیـاو) ، گـەورەی ئـازاد كار (ژن ) .

حاڵەتەدا باوکی مردووەکەی لە گەڵ بێ باوك میرات وەردەگرێ و باپیر بێ بەش دەبێ .

نەنکەکان بە تەواوی بێ بەش دەبن بە دایك ، ئیتر یەکسانە لە لای دایکەوە بن یا لە لای باوکەوە بن یا لە لای باپیر یان بەرەو ژوور بێ ، ئەمە مانای فەرموودەی (( من کل جهە)) واتە : لە هەموو روویەکەوە بن ، وە فەرموودەی (( فافهمه وقس ما اشبهه)) زیادەیە لە باسەکەدا .

هەروەها کوڕی کوڕ بێ بەش دەبێ بە کوڕ ، وە هەموو کوڕی کوڕێ بەرەو خوار بێ بێ بەش دەبێ بە کوڕی کوڕێ کە بەرەو ژوور تر بێ لێی ، واتە لە مردووەکەوە نزیك تر بێ ، ئەم باسە پێشکەوت لە فەرموودەی :

(( ومالذي البعد مع القريب - في الإرث من حظ ولا نصيب ))

و ببني البنين كيـــف كانوا　　　سيان فيه الجــمع والــوحدان

براکان بێ بەش دەبن بە کوڕی کوڕ هەرچۆن بن – یەکسانە تێدا کۆ بن یا تاك .

ويفضل ابن أم بـالإســـقاط　　　بـالجــد فافهمه على احتيــاط

کوڕی دایك زیادەی هەیە بە بێ بەشی – بە باپیر بەراستی تێبگە لە سەر ئیحتیات و یەقین .

وبـالبنـات وبنـــــات الابن　　　جمعا ووحدانا فقــل لـي زدني

بێ بەش دەبێ بە کچان و کچانی کوڕ – کۆ بن و تاك بن بڵێ پێم ، زیادی بکە لەم زانیاریە بۆم .

براکان بێ بەش دەبن بە کوڕەکان ئیتر برای باوك و دایکی بن یا برای باوکی یا برای دایکی یا جۆراوجۆر بن .

وە هەروەها بێ بەش دەبن بە باوکی نزیك ، ئەو باوکەی هۆیەکی راستەوخۆ بێ بۆ بوونی مردووە میرات لێ براوەکە ، مردووەکە نێر بێ یان مێ ، وە براکان بێ بەش دەبن بە کوڕ وکوڕی کوڕ با بەرەو خوار بڕۆن

وەکو مەبەست نی یە ، بەڵکۆ چۆن چەند برایەك بیٚ بەش دەبن برایەك یان دوانیش بیٚ بەش دەبن .

وە چۆن چەند کوڕیٚ و کوڕی کوڕیٚ بیٚ بەشیان دەکەن هەروەها کوڕیٚك و کوڕی کوڕیٚکیش با بەرەو خوار بیٚ بیٚ بەشیان دەکەن ئا بقەمە بڕیاری داوە (رحبیە) کە فەرموویەتی ( سیان فیە الجمع والوحدان ) یەکسانە تیا کۆ بن یا تاك .

کوڕی دایك زیادەیەکی هەیە بە سەر کوڕی باوك و دایکی دا و کوڕی باوکیدا بەوەی بیٚ بەش دەبیٚ بە باپیر با بەرەو ژوور بڕا ، وە هەروەها بە یەکیٚك یا زیاتر لە کچ و کچی کوڕ کوڕی دایك بیٚ بەش دەبیٚ . کوڕی دایك بیٚ بەش دبیٚ بە شەش کەس : کوڕ ، کوڕی کوڕ ، باوك ، باپیر ، کچ ، کچی کوڕ ، خوشك بە گشتی وەك برا وایە ، بە رای سەرجەم زاناکان لە هەموو ئەو حوکمانی پیٚشوودا .

**ثم بنات الابن يسقطن متى حاز البنات الثلثين يـــا فتى**

لە پاشا بیٚ بەش دەبن کچانی کوڕ کاتیٚ – کچان دوو سیٚ یەك وەردەگرن ئەی گەنج

**إلا إذا عصـــبهن الـــذكـــر من ولد الابن على مـــا ذكروا**

مەگەر کاتیٚ مەبیٚ نیٚر بیانکەن بە عەصەبە – لە کوڕی کوڕ لە سەر ئەوەی باسیان کرد .

**ومثلهن الأخـــوات اللاتـــي يدلين بالقرب مـــن الجهات**

وەك کچان وان خوشکانیٚ کە – بە نزیکی هاتبن لە لای باوك و دایکەوە

**إذا أخـــذن فـــرضهن وافيـــا أسقطن أولاد الأب البواكيـــا**

کاتیٚ وەری گرن بەشی خۆیان بە تەواوی کە دوو سیٚ یەکە – بیٚ بەش دەکەن ئەولادی باوکی کە گریان بەشیانە .

وإن يكن أخ لهن حاضـــرا          عصبهن باطنـــا وظاهـــرا

ئەگەر لە گەڵ خوشکەکاندا برای باوکی بوو– بە ئاشکراو پەنهانی دەیان کەن بە عەصەبە .

ئەگەر کچان و کوڕ کۆبوونەوە وە کچەکان دووسیێ وەربگرن کە دوان یان زیاتر بن ، کچانی کوڕ بیێ بەش دەبن هەرچۆن بن ، یەکێك یا زیاتر بن پلەکەیان نزیك بیێ یا دوور بیێ ، پلەکەیان یەك بیێ یا جیاواز بیێ بە رای سەرجەم زاناکان ، مەگەر کاتیێ نەبیێ کوڕی کوڕ ببیێ ئەوەی دەیان کەن بە عەصەبە ، ئەگەر لە پلەی ئەوانا بیێ یان نزم تر بیێ لێیان لە سەر ئەوەی جمهوری زاناکان بڕیاریان پیێ داوە نایکات بە عەصەبە ، لە کچانی کوڕ کە لە پلەدا لە خوارەوە بیێ بەڵکو بەربەیستیان دەکات لە بەر نزیکی کوڕی کوڕەکە لە مردووەکەوە .

خوشکانی باوك و دایکی وەك کچان وایە لە هەموو ئەو شتانەی باسمان کرد ئەوە مەبەستە بە فەرموودەی (یدلین بالقرب مـــن الجهات ) واتە : لە لای دایك و باوکی یەوە هاتبن کاتیێ کە ئەو خوشکانی باوك و دایکیانە دووسیێ یەکیان وەرگرت.خوشکی باوکی بیێ بەش دەکەن هەرچۆنێك بن ، مەگەر کاتیێ نەبیێ برای باوکیان لە گەڵ بیێ ئەوە لەو کاتەدا دەیان کەن بە عەصەبە وە فەرموودەی ( وافیا) بەشەکەیان تەواو دەبیێ کە دوو سیێ یەکە ، خۆی پاراستوە لەوەی کە خوشکی باوك و داکییەك بیێ ئەوە نیوە وەردەگریێ وە بیێ بەشی ناکات خوشکی باوکی بەڵکو ($\frac{1}{6}$) شەش یەك وەردەگریێ لە گەڵیا وەك رابوورد.

نمونە : پیاوێك مردووە : دایك و برای دایکییەك و خوشکی باوکی و خوشکێکی باوکی و دایکی هەیە :

| خوشکی باوك و دایکی | برای دایکی | خوشکی باوکی | دایك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | ٦ |
| ٣ | ١ | ١ | ١ | |

وه فـەرمووده‌ی (البواکیا) ئاماژه‌یـه بـۆ ئـه‌وه‌ی ئـه‌ولادی بـاوکی واتـه خوشـکانی بـاوکی لـه‌و کاتـه‌دا گریـان به‌شـیانه چـونکه بـیٚ بـه‌ش بـوون بـه خوشـکانی بـاوك و دایکـی ، وه فـه‌رمووده‌ی ( ظـاهرا و باطنـا ) دیٚـری هۆنراوه‌که‌ی پیٚی ته‌واو کردووه .

وليس ابن الأخ بالمعصـــب        من مثله أو فوقـه في النسـب

نایکات به عه‌صه‌به کوڕی برا – که‌سیٚ ویٚنه‌ی بیٚ وه‌ك کچی برا . یا له سه‌رویه‌وه بیٚ له رشته‌دا .

کوڕی برا با به‌ره‌و خوار بروات کچی برا لـه پلـه‌ی ئـه‌ودا بـیٚ نایکـات بـه عه‌صه‌به ، ، وه ئه‌و کـچی برایـه‌ش که لـه سـه‌ریه‌وه بـیٚ بـه رای زاناکـان ، لـه به‌ر ئه‌وه‌ی له ( ذو الأرحام) ن به پیٚچه‌وانه‌ی کوڕی کوڕ ئـه‌وه‌ی ده‌یکـات بـه عه‌صه‌به کچی کوڕ که له پله‌یا بیٚ یا له سه‌ریه‌وه بیٚ ، له به‌ر ئه‌وه‌ی خاوه‌ن پشکن ، هه‌روه‌ها کوڕی برا نایکات به عه‌صه‌به که‌سیٚ که له سه‌ریوه بیٚ له خوشکان له به‌ر ئه‌وه‌ی به به‌شی خۆیان ده‌وڵه‌مه‌ندن .

وه لـه پـه‌رتوکی (مغـني المحتـاج)دا بـه‌رگی سـیٚ ئـه‌م روونکردنـه‌وه‌ی خواره‌وه هاتووه سه‌باره‌ت به حه‌جب به‌ربه‌ست کردن :

(١) باوك ، کوڕ ، میٚرد : به که‌س به‌ربه‌ست نابن .

(٢) برای باوك و دایکی: به‌ربه‌ستی ده‌یکات: باوك ، کوڕ ، کوڕی کوڕ .

(٣) بـرای بـاوکی : چـوار کـه‌س به‌ربه‌سـتی ده‌کـات لـه میرات : بـاوك ر، کوڕ ، کوڕی کوڕ ، برای باوك و دایکی .

(٤) برای دایکی شه‌ش که‌س به‌ربه‌ستی ده‌کات له میرات : باوك ، باپیر ، کوڕ ، کوڕی کوڕ ، کچی کوڕ ، به رای سه‌رجه‌م زاناکان .

(٥) کوڕی برای باوك و دایکی شه‌ش که‌س به‌ربه‌ستی ده‌کات لـه میرات : باوك ، باپیر ، کوڕ ، کوڕی کوڕ برای دایك و باوکی ، برای باوکی .

(٦) کوڕی برای باوکی حەوت کەس بەربەستی دەکات لە میرارت : باوک ، باپیر ، کوڕ کوڕی کوڕ ، برای دایك و باروکی ، برای بابوکی ، کوڕی برای باوك و دایکی .

(٧) مامی باوك و دایکی هەشت کەس بەربەستی دەکات لە میرات: باوک ، باپیر ، کوڕ کوڕی کوڕ ، برای دایك و باروکی ، برای بابوکی ، کوڕی برای باوك و دایکی ، کوڕی برای باوکی .

(٨) مامی باوکی لە نۆکەس بەربەست دەبیٚ لە میرات : باوك ، باپیر ، کوڕ ، کوڕی کوڕ ، برای دایك و باوکی ، برای بابوکی ، کوڕی برای باوك و دایکی ، کوڕی برای باوکی ، مامی باوك و دایکی .

(٩) کوڕی مامی باوك و دایکی بە دە کەست بەربەس دەبیٚ لە میرات : باوك ، باپیر ، کوڕ ، کوڕی کوڕ ، برای دایك و باوکی ، برای باوکی ، کوڕی برای باوك و دایکی کوڕی برای باوکی ،مامی باوك و دایکی، مامی باوکی .

(١٠) کچی کوڕ بیٚ بەش دەکات لە میرات کوڕ ، دوو کچ ئەگەر کەس نەبیٚ نەك کچی کوڕە بکات بە عەصەبە .

(١١) نەنك لە لای دایکییەوە بیٚ بەش ناکات لە میرات جگە دایك نەبیٚ .

(١٢) نەنکی لای باوك بیٚ بەس دەبیٚ لە میرات بە باوك و دایك .

(١٣) نەنکێکی نزیك لە لای دایکەوە وەك دایکی دایك بیٚ بەش دەکات نەنکی دوور لە لای باوکەوە وەك دایکی باوك ، نەنکێکی نزیك لە لای باوکەوە نەنکێکی دوور بیٚ بەش ناکات لە لای دایکەوە .

(١٤) خوشکی باوك و دایکی یان باوکی وەك برا وایە برا بە کیٚ بیٚ بەش ببیٚ هەروەها خوشکێش بەو کەسە بیٚ بەش دەبێت .

کەواتە خوشکی باوك و دایکی بیٚ بەش دەبێت : بە باوك ، کوڕ ، کوڕی کوڕ ، بە دوو کچی مردووەکە و بە دوو کچی کوڕیشی ئەگەر لەگەڵ ئەم خوشکەدا کەسێکی وەها نەبیٚ بیکات بە عەصەبە ، وە خوشکی باوکی

بەمانە بیٚ بەش دەبیٚ ، وە بە برای باوك و دایکیش وە بە دوو خوشکی دایك و باوکیش بەو مەرجەی برای باوکی لە گەڵ ئەم خوشکەدا نەبیٚ .

هەروەها بیٚ دەبیٚ بە خوشکێکی باوك و دایکی ئەگەر لە گەڵ کچی مردووە یا لە گەڵ کچی کوڕیا بیٚ .

(١٥) کچ دوان بن یا زیاتر کچی کوڕ بیٚ بەش دەکا یەکێك بن یا زیاتر مەگەر کاتیٚ نەبیٚ کە کوڕی کوڕی لە گەڵ بیٚ و بیکات بە عەصەبە .

(١٦) خوشکی باوك و دایکی دوان یا زیاتر بن خوشکی باوکی بیٚ بەش دەکەن یەکێك بن یا زیاتر مەگەر کاتیٚ نەبیٚ برای باوکی لە گەڵ بیٚ ئەوە دەیانکات بە عەصەبە یان خوشکی دایك و باوکییەکە یەکێك بیٚ ئەوە لەو کاتەدا خوشکی باوکییەکە هەرچەند بن شەش یەك وەردەگرن .

## پرسیار و راهێنان

١- روونی بکەرەوە ئەو کەسەی بێ بەش دەکرێ بە (حجب الحرمان) بەربەستی تەواو ، وە ئەو کەسەی بێ بەش دەکرێ بە (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو لە گەڵ رونکردنەوەی بەربەستکار لە هەردوو حاڵەکەدا ، وە ئەو کەسەی بەربەست ناکرێ ، لە هەموو یەکێك لەوانەی دێت باسکردنیان :

دایك : (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو دەبێ لە ($\frac{1}{3}$) سێ یەك بۆ ($\frac{1}{6}$) شەش یەك ، لە کاتی بوونی ئەولادی مردووەکە وە یا دوو یا زیاتر لە خوشك و برا ببێ ، وە کەم جارێ بەشی دایك دەڕوا بۆ سێ یەکی ماوە کە کەمترە لە سێ یەکی ماڵەکە بە هۆی ئەوەی مردووەکە باوك و دایکی و یەکێ لە ژن و مێردی ببێ .

٢- مێرد : (حجب النقصان ) بەربەستی ناتەواو دەبێ لە ($\frac{1}{2}$) نیوە بۆ ($\frac{1}{4}$) چوار یەك بە هۆی منداڵی ژنەکەی لەو بێ یان نا .

٣- کوڕ : هەرگیز بێ بەش نابێ .

٤- کوڕی کوڕ : (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو دەبێ بە هۆی بوونی کوڕەوە .

٥- برای باوك و دایکی : (حجب الحرمان) بەربەستی تەواوبە هۆی بوونی باوك و کوڕ و کوڕی کوڕ .

٦- برای دایکی : (حجب الحرمان) بەربەستی تەواودەبێ بە هۆی بوونی باوك و باپیر و کوڕ و کچ و کوڕی کوڕ و کچی کوڕ .

٧- برای باوکی : (حجب الحرمان) بەربەستی تەواو بە هۆی بوونی باوك و کوڕ و کوڕی کوڕ و برای باوکی و دایکی .

٨- ژنی گەورەی ئازادکار : بێ بەش دەکات رشتەی لە بەر ئەوەی شیاوترە بە میرات لە ئازادکار .

٩- کچ : هەرگیز بێ بەش نابێت .

١٠- مامی باوك و دایکی : (حجب الحرمان) بەربەستی تەواو دەبێ بە باوك و باپیر و کوڕ و کوڕی کوڕ و برای باوك و دایکی و برای باوکی و کوڕی برای باوك و دایکی و کوڕی برای باوکی .

١١- کچی کوڕ : بەشی نیوە و شەش یەکە ئەو کەسەی بێ بەشی دەکا لە نیوە بۆ شەش یەك کچێکی تەنهایە لە گەڵ ئەوەشدا کەسێ نەبێت کچی کوڕ بکا بە عەصەبە ، واتە : برای خۆی لە گەڵ نەبێ .

١٢- باپیر فەرعی میراتگری نێرینە ( حجب النقصان) بەربەستی ناتەواوی دەکات لە تەعصیبەوە بۆ شەش یەك ، وە (حجب الحرمان) بەربەستی تەواوبە باوك و و باپیرێکی وا نزیکتر بێت لە مردووەکەوە لەو پلەدا ، (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو لە تەعصیبەوە بۆ شەش یەك .

(٣) میرات گر و بەشەکانیان روون بکەرەوە و بێ بەشەکان و جۆرەکانی و بەربەستکار بۆ هەموو مەسئەلەیە لەم مەسائیلانەی کە دێت .

(١) پیاوێك مردووە ژنێك و کچ و کچی کوڕێك و دایك و باپیر باوکی باوکی هەیە :

| ژن | کچ | کچی کوڕ | دایك | باپیر | مسئله |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ | ١/٦ +ماوە | ٢٤ بەرز بۆ ٢٧ |
| ٣ | ١٢ | ٤ | ٤ | ٤ | |

کچی کوڕ بێ بەش بوو بە (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو لە نیوە بۆ شەش یەك بە هۆی بوونی کچەوە .

ژن : بێ بەش بوو بە (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو لە چوار یەك بۆ هەشت یەك بە هۆی فەرعی میراتگرەوە .

دایك : بێ بەش بوو بە (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو لە سێ یەك بۆ شەش یەك بە هۆی فەرعی میراتگرەوە .

باپیر : بێ بەش بوو بە (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو لە لە عەصیبەوە بۆ شەش یەك و ماوە .

(٢) ژنێك مردووە : مێرد و كوڕ و برایەكی باوك و دایكی ، باوك و دایكی هەیە :

| مێرد | كوڕ | برای باوك و دایك | دایك | باوك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ماوە | بێ بەش | ١/٦ | ١/٦ | ١٢ |
| ٣ | ٥ | | ٢ | ٢ | |

مێرد : بێ بەش بوو بە ((حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو لە نیوە بۆ چوار یەك بە هۆی بوونی فەرعی میرات گر .

برا : بێ بەش بوو بە ((حجب الحرمان) بەربەستی تەواو بە هۆی بوونی باوك و كوڕ .

باوك : بێ بەش بوو بە (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو لە تەعصیبەوە بۆ شەش یەك بە هۆی بوونی فەرعی میراتگر كە كوڕە .

دایك : بێ بەش بووە بە (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو لە سێ یەكەوە بۆ شەش یەك بە هۆی بوونی فەرعی میراتگر كە كوڕە .

(٣) ژنێك مردووە : خوشكێكی باوكی و دایكی ، خوشكێكی باوكی و ، دوو خوشكی دایكی و ، دایكێكی هەیە :

| خوشكی باوك و دایك | خوشكی باوك | ٢خوشكی دایك | دایك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٣ | ١/٦ | ٦ بەرز بۆ ٧ |
| ٣ | ١ | ٢ | ١ | |

خوشكی باوك : بێ بەش بوو بە (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو لە نیوە بۆ شەش یەك بە خوشكی باوك و دایكی .

دایك : بێ بەش بوو (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو لە سێ یەك بۆ شەش یەك بە هۆی بوونی خوشكەكان .

(٤) پیاوێك مردووه برایەکی باوك و دایکی و برایەکی باوکی ، برایەکی دایکی ، دایکی هەیە :

| برای باوك و دایکی | برای باوکی | برای دایکی | دایك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ماوە | بێ بەش | ١/٦ | ١/٦ | ٦ |
| ٤ | | ١ | ١ | |

برای باوکی : بێ بەش دەبێ بە (حجب الحرمان) بەربەستی تەواو به هۆی بوونی برای باوك و دایکی .

دایك : بێ بەش دەبێ بە (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو به هۆی بوونی براکان .

(٥) پیاوێك مردووه : باپیر باوکی باوك ، مامی باوك و دایکی ، برایەکی باوکی هەیە :

| باپیر | برای باوکی | مام | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١ | ١ | بێ بەش | ٢ |

مام بێ بەش دەبێ بە (حجب الحرمان) بەربەستی تەواو به هۆێ بونی باپیر .

(٦) پیاوێك مردووه : باوك و دایك و کچێك و نەنکی دایکی دایك ، برایەکی باوك و دایکی هەیە :

| کچ | باوك | دایك | نەنك | برا | مسئله |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦+ماوە | ١/٦ | بێ بەش | بێ بەش | ٦ |
| ٣ | ١+١=٢ | ١ | | | |

برا بێ بەش دەبێ بە (حجب الحرمان) بەربەستی تەواو به هۆی بوونی باوکەوە .نەنك : بێ بەش دەبێ ب (حجب الحرمان) بەربەستی تەواو به هۆی بوونی دایکەوە .

(٧) ژنێك مردووه مێرد و باوك و دایك و كچی كوڕێكی هەیە :

| مێرد | باوك | دایك | كچی كوڕ | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦+ماوە | ١/٦ | ١/٢ | ١٢ بەرز بۆ ١٣ |
| ٣ | ٢ | ٢ | ٦ | |

مێرد : بێ بەش دەبێ (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو بە هۆی بوونی فەرعی میرات كچی كوڕ .

دایك : بێ بەش دەبێ (حجب النقصان) بەربەستی ناتەواو بە هۆی بوونی فەرعی میرات كچی كوڕ لە سێ یەك بۆ شەش یەك .

(٤) روونی بكەرەوە بەشی هەموو یەكێ: لەو میراتگرانەی باسیان دەكەین لەمەدوا ، ئەگەر یەكێكیان بگۆڕێ بە هۆی بوونی میرات گرێكی دیاری كراو روونی بكەرەوە وە باسی بەشی لە میرات لە هەموو حاڵەتێكدا بكە :

– مێرد : دوو جۆر بەشی هەیە نیوە و چواریەك ، ئەو كەسەی بەربەستی دەكات لە نیوە بۆ چوار یەك ، بە هۆی منداڵی ژنەكەیەتی لەو بێ یان لەو نەبێ ، واتە : لە ژنەكە لە مێردێكی تر منداڵی هەبێ .

– باوك : میرات وەردەگرێ بە تەعصیب هەموو ماڵی مردووەكە یا هەمووی ئەوەی دەمێنێتەوە وە لە پاش خاوەن بەشەكان ئەوەی دەیگەرێتەوە بۆ بەش بوونی ئەولادی یا ئەولادی كوڕی مردووەكە .

– دایك : بەشی سێ یەك و شەش یەكە ، ئەوەی بەربەستی دەكات لە سێ یەك بۆ شەش یەك بە هۆی بوونی منداڵی مردووەكەوەیە یا دوو یا زیاتر لە خوشك و برای مردووەكە لە هەر روویەكەوە بێ .

– ژن : بەشی چوار یەك و هەشت یەكە ، ئەوەی بەربەستی دەكات لە چوار یەك بۆ هەشت یەك منداڵی مێردەكەیەتی لە خۆی بووبێ یا لە ژنێكی تر ، واتە : مێردەكەی لە ژنێكی تر منداڵی هەبێ .

- کچی کوڕ : بەشی نیوە و شەش یەکە ، ئەوەی بەربەستی دەکات لە نیوە بۆ شەش یەك کچێکی تەنهایە لە گەڵ نەبوونی کچی کوڕ کە بیکا بە عەصەبە .

- برای دایکی : بەشی سێ یەك و شەش یەکە ، ئەگەر یەکێك بوو شەش یەك وەردەگرێ ، وە ئەگەر دوان یان زیتر بن سێ یەك وەردەگرن .

- نەنك : ئەگەر یەکێك بوو شەش یەك وەردەگرێ وە ئەگەر زیاتر بوون ئەوە هەموویان هاوبەشن لە شەش یەکدا گەر پلەکانیان وەك یەك وابوون وە نزیکەکان دوورەکان بێ بەش دەکەن وە نەنکەکان هەموویان بێ بەش دەبن بە باوك .

## باب المشركة

## باس لە مەسئەلەی موشەڕەکە دەکات

واتە : مەسئەلەی (مشرکە) هاوبەشە لە نێوان عەصەبەی شەقیق (برا و خوشکی دایك و باوکی ) و ئەولادی دایکیدا دەبێ ، وە (مشرکە) بە فەتحەی راو کە سەری ببێ ، وە هەندێك خوێندوویانەتەوە بە کەسرەی راو واتە ژێری هەبێ لە سەر ئەوەی لکاندن هاوبەشیەکە بۆ ئەم مەسئلە مەجازییە ، وە هەندێك ناویان ناوە بە مەسئەلەی (مشترکە) وەك دانەر باسی کردووە [1] .

---

[1] ئەو زانایانەی بڕیاریان داوە بە بوونی مەسئەلەی (مشرکە) سێ مەرجیان بە مەرج بۆ گرتووە :

یەکەم : دەبێ ئەولادی دایك (خوشك و برای دایکی)دوان یان زیاتر بن.ئەگەر یەکێك بێ ئەوە ئەو مەسئەلەیە نایەتە جێ لە بەرئەوەی یەکێك لە ئەولادی دایك شەش یەك وەردەگرێ وە شەش یەکێش دەمێنێتەوە بۆ برای دایك و باوکییەکان وەك ئەم نمونە :

| مێرد | دایك | برای دایکی | ٢برای باوك و دایك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ | ماوە | ٢×٦ ١٢ |
| ٣ | ١ | ١ | ٢ | |
| ٦ | ٢ | ٢ | ٢ | |

دووەم : دەبێ ئەولادی باوك و دایکیەکان نێر بن یا نێر لە گەڵ مێدا بن ، ئەگەر هەر مێ بوون ئەم مەسئەلەیە نایەتەجێ لە بەرئەوەی خوشکی باوك ودایکی خاوەن بەشی دیاری کراون دووسێ یەك وەردەگرن ، ئەگەر دوان یان زیاتر بوون وەك ئەم نمونە:

| مێرد | دایك | ٢ برای دایکی | ٣خوشك باوك و دایکی | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٣ | ٢/٣ | ٦ بەرزبویە بۆ |
| ٣ | ١ | ٢ | ٤ | ١٠ |

وە خوشکەکە نیوە وەردەگرێ ئەگەر یەکێك بێ وە بەرز دەکرێتەوە مەسئەلەکە بۆیان نمونە بۆ نیوە کە وەری دەگرێ وەکو :

**وإن تجد زوجا وأما ورثـــا          وإخوة للأم حـازوا الثـلثـــا**

ئەگەر مێرد و دایك میراتگر بوون دەستت کەوت – وە چەند برایەکی دایکی کە سێ یەك وەردرن .

**وإخـــوة أيضـــا لأم وأب          واستغرقوا المال بفرض النصب**

هەروەها چەند برایەکی باوك و دایکیش – هەموو ماڵیان وەردەگرت بە دانانی بەش .

**فــاجعــلهــم كلهـــم لأم          واجعــل أباهم حجرا في اليــم**

هەموویان بە برای دایکی دابنێ – وە باوکیان بە بەردێکی بن لە دەریا دابنێ .

**واقسم على الإخوة ثلث التركة          فهـــذه المسألة المشتركـــة**

وە سێ یەکی ماڵەکە دابەش بکە بە سەر براکانا – ئەمە مەسئەلەی (مشترکە) یە .

وێنەی مەسئەلەی (مشترکە) ئەوەیە ژنێك لە دوی جێ بمێنێ مێردج و دایك و ژمارەیە لە برای دایکی دوان یا زیاتر ، وە برای باوك و دایکی یەکێك یا زیاتر یەکسانە لە گەڵیانا بێ خوشکێکی باوك و دایکی یا زیاتر

---

| مێرد | دایك | ٢برای دایکی | خوشکی باوك و دایکی | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٣ | ١/٢ | ٦ بەرز بۆ ٩ |
| ٣ | ١ | ٢ | ٣ | |

سێهەم : دەبێ ئەولادی دایك و باوکی بن ، نابێ برای باوکی بن ، ئەگەر برای باوکی بن بێ بەش دەبن بە لای سەرجەم زاناکان نمونە وەك :

| مێرد | دایك | ٢برای دایکی | ٢برای باوکی | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٣ | ماوە<br>هیچ نەمایەوە بۆیان لە بەر ئەوەی بە هۆی دایکەوەدەبن | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | بە هاوبەش خۆ ئەمان دایکیان جیاوازە لە گەڵ برا دایکیکاندا | |

یا نه‌بێ واته : مه‌سئه‌له‌ی (مشترکه) له‌م میاتگرانه پێك هاتووه : مێرد ، دایك یا نه‌نك دایکی دایك ، چه‌ند خوشك و برایه‌کی دایك و باوکی ، به‌راستی به‌شه‌کان له‌م مه‌سئه‌له هه‌موو میراتیه‌که داگیر ده‌کا : نیوه بۆ مێرد ، شه‌ش یه‌ك بۆ دایك ، سێ یه‌ك بۆ ئه‌ولادی دایك ، ئه‌وه‌ی قیاس بێ بێ به‌ش بوونی برا باوك و دایکی یه‌کانه له به‌ر ئه‌وه‌ی عه‌صه‌به‌ن ئا به‌مه بڕیاری داوه ئیمامی ئه‌بو حه‌نیفه و ئه‌حمه‌د ، وه گێڕاوێانه‌ته‌وه له ئیمامی شافیعییه‌وه مه‌سئه‌له‌که به‌م شێوه‌یه له سه‌ر ئه‌م رایه که باسکرا .

| مێرد | دایك | ٢برای دایکی | ٤برای باوك و دایکی | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٣ | ماوه<br>هیچ نه‌ماوه | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | | |

وه مه‌زهه‌بی پشتی پێ به‌سرا بێ له لای ئیمامی شافیعی ئه‌وه‌یه هه‌موویان دابنرێن به ئه‌ولادی دایك ، له به‌ر ئه‌وه‌ی هاوبه‌شن له‌وه‌ی که له یه‌ك دایکن ، به‌تاڵ کراوه‌ته‌وه نزیکایه‌تی باوك له مافی عه‌صه‌به برای دایك و باوکی یه‌کێك بێ یا زیاتر تا بێ به‌ش نه‌بن .

وه دابه‌ش ده‌کرێ به سه‌ر هه‌موویانا سێ یه‌ك که به‌شی ئه‌ولادی برا دایکی یه‌کانه ، وه یه‌کسانه له‌و به‌شه‌دا نێر و مێ ، له هه‌ردوو کۆمه‌ڵه‌که‌دا وه به‌مه بڕیاریان داوه ئیمامی مالك و ئه‌هلی مه‌دینه و بصره و شام ، وه مه‌سئه‌له‌که به‌م شێوه‌یه :

| مێرد | دایك | ٢برای دایکی | ٤برای باوك و دایکی | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | | ماوه<br>به یه‌کسانی له نێوان نێرومێ | ٦ × ٣<br>١٨ |
| ٣ | ١ | ٢ | | |
| ٩ | ٣ | ٦ | | |

وه فه‌رمووده‌ی ((واجعل آباهم في اليمّ )) وه‌ك باوکیان نه‌بووبێ وای لێ ده‌کرێ ، ئاماژه کراوه بۆ ئه‌وه‌ی ئیمامی شافیعی گه‌ڕاندوێه‌تیه‌وه که برا باوك و داکییه‌کان وتیان به حه‌زره‌تی عمر له کاتێکدا ویستی بێ به‌شیان

بكات ئەی كار بە دەستی موسڵمانان وا دابنێ باوكمان بەردێكە فڕێ درابێتە ناو دەریاوە ، وە لە ڕێوایەتیكدا وای دابنێ باوكمان كەرە ، ئایا دایكمان یەكێك نی یە ؟ ئەم قسەیەی بە جوان زانی وە حەزرەتی عمر حوكمی كرد لە نێوانیاندا بە هاوبەش هەر لە بەر ئەمەیە نازناوی دەركرد بە (یمیه) وە (حجریه) وە (حماریه) ئەگەر لە باتی دایك لە مەسئەلەكەدا نەنك بێ حوكمەكە جیاوازی نی یە وەك ئەم نمونە :

| مسئله | ٤برای باوك و دایكی | ٢برای دایكی | دایك | مێرد |
|---|---|---|---|---|
| ٣×٦ | ماوە | | ١/٦ | ١/٢ |
| ١٨ | | | | |
| | | ٢ | ١ | ٣ |
| | | ٦ | ٣ | ٩ |

ئەگەر برای دایكی یەكێك بوو ئەوە مەسئەلەی مشتركەی پێ ناوترێ لە بەر ئەوە خاوەن بەشەكان ماڵەكە هەمووی وەرناگرن و بەشی برای دایك و باوكییەكان دەمێنێتەوە وەك ئەم نمونەیە :

| مسئله | ٤برای باوك و دایكی | ١برای دایكی | دایك | مێرد |
|---|---|---|---|---|
| ٤×٦ | ماوە | ١/٦ | ١/٦ | ١/٢ |
| ٢٤ | | | | |
| | ١ | ١ | ١ | ٣ |
| | ٤ | ٤ | ٤ | ١٢ |

لە بەر ئەوەی یەك دابەش ناكرێ بە سەر چوار برادا بە یێ كەرت كە چوار براكەن كەرەتی مەسئەلەكە دەكەین .

## باب ميراث الجد والأخوة

## میراتی باپیر له گەڵ برا و خوشکدا

**ونبتدي الآن بما أردنـــــــا      في الجد والإخوة إذ وعدنـــــــا**

ئیستا دەست دەکەین بەوەی ویستمان - لە باپیر و براکان کاتێ پەیمانمان دا .

**فائلق نحو ما أقول السمعـــا      واجمع حواشي الكلمات جمعـــا**

گوێم بۆ شلکه وا پێت دەڵێم - وه لە زەینی خۆتدا کۆی بکەرەوه پەراوێزی وشەکان بە کۆی.

دەستی کردە روونکردنەوەی حوکمی باپیر و خوشك براکان : لە بەر ئەوەی خاوەنی رحبیە پەیمانی دا لە پێشەوە بە فەرموودەی خۆی :

(( وحكمهم وحكمه سيأتي      مكملا البيان في الحالات ))

مەبەست بە براکان (اخوه) رەگەزە بۆ ئەوەی برایەکی تەنها و زۆر بگرێتەوە نێر بێ یا مێ لە باوکی و دایکی بن یا لە باوکی جگە برای دایکی لە بەر ئەوەی برای دایکی بێ بەش دەبێ بە باپیر وەك رابوورد لە باسی حەجبدا .

دانەر ئاماژەی کرد بە فەرموودەی خۆی (فالق نحو ما اقول السمعا..الخ) بۆ گرنگی دانی لە ناسینی درێژەی حاڵو حوکمیان لە بەر ئەوەی لە گرنگەکانە .

**واعلم بأن الجد ذو أحـــوال      أنبيك عنهن على التوالـــــي**

بزانە بەراستی باپیر خاوەنی چەند حاڵێکە -- هەواڵت دەدەمێ لە حاڵەکانی بە دوای یەکدا .

**يقاسم الإخوة فيهــــن إذا      لم يعد القسم عليه بـــــالأذى**

باپیر برا بەش دەبێ لەو حاڵانە کاتێ - ئەو برا بەشیە بە زیان نەگەرێتەوە سەری .

فتارة يأخذ ثلثا كامـــــلا إن كان بالقسمة عنه نــــازلا

باپیر جارێك سێ یەكی تەواو وەردەگرێ ئەگەر برا بەشیەكە كەمتر بوو لە سێ یەك .

إن لم يكن هناك ذو سهــــام فاقنع بإيضاحي عن استفهــــام

ئەگەر لە گەڵ باپیر و براكاندا خاوەن بەشەكان لەوێدا نەبوو — تۆ بە روونكردنەوەی من قایل بە بە پرسكردن بۆ تێگەیشتن .

وتارة يأخذ ثلث الباقــــــي بعد ذوي الفــــــروض والأرزاق

باپیر جارێك سێ یەكی ماوە وەردەگرێ — لە دوای خاوەن بەش و رزق و روزییەكان .

هذا إذا ما كانت المقاسمــــة تنقصه عن ذاك بالمزاحمــــــة

ئەم سێ یەكی ماوە ئەگەر برا بەشیەكە لەوە كەمتر بێ بە هۆی زۆری میراتگرانەوە .

وتارة يأخذ سدس المــــــال وليس عنه نــــازلا بحــــــال

وە جارێك شەش یەكیماڵەكە وەر دەگرێت — باپیر دانابەزێ لە شەش یەك بە هیچ حاڵەتێك .

باپیر لە گەڵ براو خوشكدا چوار حاڵەتی بۆ هەیە :

حاڵەتی یەكەم : باپیر هاوبەش دەبێ لە گەڵ براو خوشكەكاندا .

حاڵەتی دووەم : سێ یەكی ماڵی بۆ دادەنرێ .

حاڵەتی سێهەم : سێ یەكی ماوەی بۆ دادەنرێ لە پاش بەشەكان .

حاڵەتی چوارەم : شەش یەكی ماڵ دادەنرێ بۆ باپیر .

حاڵەتی یەكەم : باپیر برا بەش دەبێ لە گەڵ براو خوشكەكاندا وەك برایەك لە ناویندا بە مەرجێك كە برا بەشیەكەی كەمتر نەبێت لە بەش كە سێ یەكی ماڵە ئەگەر لە گەڵیاندا خاوەن بەش نەبێت ، ئەگەر خاوەن بەشیان لە گەڵ بوو دادەنرێ بۆی برا بەشی مادەم برا بەشیەكە كەمتر نەبێ

له سێ یەکی ماوە لە پاش بەشەکان یان شەش یەکی هەموو ماڵەکە ئا ئەوە مەبەستە بە فەرموودەی (( إذا لم یعد القسم علیه بالأذی )) .

بەشێوەیە پەیدا ببێ بۆ باپیر بە برا بەش وێنەی ئەوەی پەیدا دەبێ بۆی بە بەش یا زیاتر لە بەش وەك مەسئەلەیە پێك هاتبێ لە باپیر و دوو برا :

| باپیر | ٢ برا | مسئله |
|---|---|---|
| ١ | ٢ | ٣ |

لەیرەدا مەسئەلەکە لە سەر سێ یە بۆ هەر یەکێکیان یەکێکی دەکەوێ .

وەك باپیر و برایەك :

| باپیر | برا | مسئله |
|---|---|---|
| ١ | ١ | ٢ |

لەیرەدا مەسئەلەکە لە سەر دووە بۆ هەر یەکێکیان یەکێکی دەکەوێ کە نیوەی مەسئەلەکەیە .

لەم دوو مەسئەلەدا باپیر برا بەشە تیایدا ، لە وێنەی یەکەمدا باپیر سێ یەکی وەرگرتووە ، وە لە دووەمدا نیوە کە زیاتر لە سێ یەك .

وەك نمونەی دایك و باپیر و برایەك :

| دایك | باپیر | برا | مسئله |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٣}$ | ماوە | | ٣ |
| ٣ | ٢ | | |
| ١ | ١ | ١ | |

مەسئەلەکە لە سێ یە ($\frac{١}{٣}$) سێ یەك بۆ دایك وە باپیر نیوەی ماوە بە برا بەشی سێ یەکی هەموو ماڵەکە دەکا کە چاکترە بۆی لە سێ یەکی ماوە لە دوای بەشی دایك وە چاکترە لە شەش یەکی هەمووی .

وەك نمونەی مێرد و باپیر و دووە برا :

| مێرد | باپیر | ٢برا | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە | | ٣×٢ |
| | | | ٦ |
| ١ | ١ | | |
| ٣ | ١ | ٢ | |

باپیر برابەش دەبێ لە ماوە لە دوای بەشی مێرد کە بەشی باپیر کەوتووە وێنەی سێ یەکی ماوەیە لە پاش بەشی مێرد ، وە وێنەی شەش یەکی هەموویەتی ، کە هەڵنەژمێردراوە برابەشی بە سەر باپیرەوە بە زیان .

حاڵەتی دووەم : ئەگەر خاوەن پشك واتە خاوەن بەشی لە گەڵدا نەبێ وەك ئەم مەسەلە کە پێك هاتووە لە باپیر و سێ برا :

| باپیر | ٢برا | مسئلە |
|---|---|---|
| ١/٣ | ماوە | ٣ × ٣ |
| | | ٩ |
| ١ | ٢ | |
| ٣ | ٦ | |

ئەگەر باپیر برا بەش بێ لەم مەسئەلەدا لە گەڵ براکاندا چوار یەکی ماڵەکەی دەست دەکەوێ ، برا بەشیەکە کەمترە لە سێ یەك ، بۆی دادەنرێ سێ یەك ، وە ئەوەی دەمێنێتەوە دابەش دەکرێ لە نێوان سێ براکەدا .

بنکەی ئەمە ئەوەیە ژمارەی براکان دوو قاتی باپیرە بێ وێنەی ئەمە هەڵنەژمیراوە ئەگەر براکان ژمارەیان کەمتر بوو لە دووقاتی باپیرە ئەوە برابەش سوودی زیاترە ، ئەمەش پێنج وێنە دەگرێتەوە :

وێنەی یەکەم : باپیر ، لە گەڵ خوشکدا :

| باپیر | خوشك | مسئلە |
|---|---|---|
| ٢ | ١ | ٣ |

مەسەلەکە لە سێ یە ، دوو بەشی بۆ باپیرە و بەشێك بۆ خوشکەکە .

وێنەی دووەم : باپیر لە گەڵ دوو خوشکدا یا برایەك :

| باپیر | ٢خوشکَك | مسئلە |
|---|---|---|
| ٢ | ٢ | ٤ |

مەسئلەکە لە چوارە : دوو بۆ باپیرە و دوو بۆ دوو خوشك .

| باپیر | برا | مسئلە |
|---|---|---|
| ١ | ١ | ٢ |

مەسـئەلەکە لـە دووە : یـەکێك بـۆ باپیرە و یەکیش بۆ براکە .

وێنەی سێهەم : باپیر لە گەڵ برا و خوشکێك یا سێ خوشك :

| باپیر | براوخوشك | مسئلە |
|---|---|---|
| ٢ | ٣ | ٥ |

مەسەلەکە لە پێنجە : دوو بۆ باپیر وە دوو بۆ برا و یەك بۆ خوشك .

| باپیر | ٣خوشك | مسئلە |
|---|---|---|
| ٢ | ٣ | ٥ |

مەسـەلەکە لـە پێنجـە : دوو بـۆ بـاپیر سێ بۆ سێ خوشکەکان

هەریەکـە لـە دووەم و سـێهەم پێـك هـاتوون لـە دوور وێنـە ، کـە هـەموی دەکاتە پێن وێنە ، وە ئەگەر ژمارەیان دوو قاتی باپیرە بوو ، ئەوە سـێ یـەك و برابەشی وەکو یەکن ، ئەکەش سێ وێنەی دەگرێتەوە "

وێنەی یەکەم : باپیر لە گەڵ دوو برادا :

| باپیر | ٢برا | مسئلە |
|---|---|---|
| ١ | ٢ | ٣ |

لەیرەدا مەسەلەکە لە سێ یە بۆ هەریەکێکیان یەکێك هەیە .

وێنەی دووەم : باپیر لە گەڵ چوار خوشکدا :

| باپیر | ٤خوشك | مسئلە |
|---|---|---|
| ٢ | ٤ | ٦ |

لـەیرەدا مەسـەلەکە لـە شەشـە دوو بـۆ بـاپیرە و چـوار بـۆ هـەر چـوار خوشکەکە ، لە مەسئلەکەدا باپیر بە برا بەش دابنیـن ئەوە مەسئـەلـەکە لە

شەشە ، وە ئەگەر باپیر سیّ یەکی بۆ دابنریّ مەسئەلەکە لە سیّ یە :

| باپیر | ٤خوشك | مسئلە |
|---|---|---|
| ١ | ٢ | ٣ ×٤ |
| ٣ | ٣ | ١٢ |
| ١ | ٢ | |
| ٤ | ٨ | |

لەیرەدا کە دوو دابەش ناکریّ بە سەر چوار خوشکدا بە بیّ کەرەت ژمارەی خوشکەکانمان کەرەتی مەسئەلەکە کرد بۆ ئەوەی بە بیّ کەرەت دابەش بکریّت .

وێنەی سێهەم : باپیر لە گەلّ برایەك و دوو خوشکدا :

| باپیر | برا | ٢ خوشك | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ٢ | ٢ | ٢ | ٦ |

ئەگەر لە مەسئەلەکەدا باپیر سیّ یەك وەرگریّ ئەو لە سیّ یە :

| باپیر | برا | و ٢خوشك | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١ | | ماوە | ٣ ×٢ |
| ٣ | | ٢ | ٦ |
| ١ | | ٤ | |
| ٢ | ٢ | ٢ | |

حالّەتی سێهەم : باپیر سیّ یەکی ماوەی بۆ دادەنریّ لە دوای بەشەکان ئەگەر لە گەلّ باپیردا بوو خاوەن بەشەکان با یەکێك بیّ ، بە مەرجیّ کە برابەش کەمتر بیّ لە سیّ یەکی ماوە و بەس ، وە سیّ یەکی ماوە نابیّ کەمتر بیّ لە شەش یەکی هەموو مالّەکە ، وەك مەسئەلەیە پێك هاتبیّ لە دایك و باپیر و سیّ برا :

| دایك | باپیر | ٣برا | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٣}$+ماوە | ماوە | ٦ |
| ١ | ١ $\frac{٢}{٣}$ | ٣ $\frac{١}{٣}$ | |

لە بەر ئەوەی ئەگەر باپیر برا بەش ببوایە پشكێكە و چوار یەكی پشكێكی دەست دەكەوت ، وە ئەگەر شەش یەكی وەرگرتایە یەك پشكی دەكەوت ، وە ئەوەی پێویست بوو بۆی لە گەڵ خاوەن بەشەكان چاكترینی ئەو سیانەیە كە لەیرەدا سێ یەكی ماوەیە ، وەك ژن و باپیر و سێ برا :

| ژن | باپیر | ٣برا | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ ماوه | ماوه | ٣×٤ = ١٢ |
| ١ | ١ | ٢ | |
| ٣ | ٣ | ٦ | |

ژن چواریەك وەردەگرێ كە پشكێك لە چوار پشك ، وە باپیر سێ یەكی ماوە كە پشكێكە ، وە بۆ سێ براكە دوو پشك ، ئەگەر باپیر شەش یەك وەرگرێ دوو سێ یەكی پشكێكی بۆ هەیە ، یا برابەش بێ لە گەڵ برا كاندا ($\frac{٣}{٤}$) سێ لە سەر چواری پشكێكی بۆ هەیە ، برابەشیش كەمتر بوو لە سێ یەكی ماوە ، پێویست بوو بۆی سێ یەكی ماوە ، لە بەر ئەوەی سێ یەكی ماوە چاكترە بۆی لە برابەش و شەش یەك .

حاڵەتی چوارەم : باپیر شش یەكی هەموو ماڵی بۆ دادەنرێ لە گەڵ خاوەن بەشەكاندا ، ئەمەش كاتێ دەبێ بە بەش كەمتر بێ لە شەش یەك و بەس ، وە كەمتر نەبێ لە سێ یەكی ماوە ، وەك ئەم نمونە : مێرد و دایك و دوو برا و باپیر :

| مێرد | دایك | باپیر | ٢برا | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ | ماوه | ٢×٦ = ١٢ |
| ٣ | ١ | ١ | ١ | |
| ٦ | ٢ | ٢ | ٢ | |

بۆ مێرد نیوە ، بۆ دایك شەش یەك ، بۆ باپیر شەش یەك وەردەگرێ كە پشكێكە لە شەش پشك ، وە زیادەی هەیە لە سێ یەكی ماوەی وەرگرتایە دوو سێ یەكی پشكێكی وەردەگرت .

هەروەها ئەگەر برابەش بوایە لە گەڵ دوو براکەدا ، برابەش کەمتر بوو لە شەش یەك و بەس ، دانرا بۆی شەش یەك ، وەك ئەم نمونە ژن ، دوو کچ ، باپیر ، برا :

شەش یەك بۆ باپیر دانرا چونکە چاکترە لە برابەش و سێ یەکی ماوە .

وە ئاماژەی کرد بە فەرموودەی (( ولیس عنه نازلا بحال )) بۆ ئەوەی بەراستی باپیر لە گەڵ براکاندا کەم ناکا لە شەش بە رای سەرجەم زاناکان ئەگەر چی زیادیشی نەبێ لە خاوەن بەشەکان جگە شەش یەك و بەس وەك : دایك ، مێرد ، باپیر ، برایە :

| مێرد | دایك | باپیر | برا | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ١/٦ | ماوە هیچ نەمایەوە | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | | |

وە هەروەها وەك دوو کچ و دایك و باپیر و چەند برایە :

| ٢کچ | ژن | باپیر | چەند برا | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ٢/٣ | ١/٦ | ١/٦ | ماوە هیچ نەمایەوە | ٦ |
| ٤ | ١ | ٢ | | |

بۆ باپیر شەش یەك دادەنرێ وە براراکان بێ بەش دەبن .

هەروەها ئەوەی زیاد بێ لە بەشەکان وە کەمتر بوو لە شەش یەکی ماڵەکە وەك مێرد ، دوو کچ ، باپیر ، چەند برایە :

| ژنی | ٢کچ | باپیر | چەند برا | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ٢/٣ | ١/٦ | ماوە هیچ نەمایەوە | ١٢ بەرز بۆ |
| ٣ | ٨ | ٢ | | ١٣ |

یان هیچی زیاد نەبیٚ وەکو دوو کچ و میٚردو دایك و باپیر و چەند برایە :

| میٚرد | ٢کچ | دایك | باپیر | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١/٤ | ٢/٣ | ١/٦ | ١/٦ | ١٢ بەرزبۆ |
| ٣ | ٨ | ٢ | ٢ | ١٥ |

باپیر کە شەش یەك وەردەگریٚ مەسئەلەکە ئەگەر بەرزنەکریٚتەوە بۆ (١٥) هیچی بۆ نامیٚنیٚتەوە کە وەری بگریٚ –بۆ باپیر شەش یەك دادنریٚ لەم دوو حالٚەدا ئەگەر مەسئەلەکە لە یەکەمدا بەرزنەکرایەوە لە (١٢) وە(١٣) وە بە تەواو کردنی شەش یەك بۆ باپیر یەك پشك دەمایەوە بۆی لە گەلٚ ئەوەی خۆی دوو پشکی دەکەویٚ .

وە مەسئەلەکەی دووەمیشی ئەگەر بەرزنەکرایەوە لە (١٢) بۆ (١٥) هیچ نەدەمایەوە بۆ باپیر وە لەگەلٚ ئەوەش بەشی خاوەن بەشەکان کەمترە بە پشکیٚك .

کەم ناکریٚ لە شەش یەك بە بیٚ زیاد کردن بە حالٚیٚ : وەك نمونەی میٚرد و دایك و باپیر و برادا هاتووە وە براکان بیٚ بەش دەبن .

**وهو مع الإناث عند القسم      مثل أخ في سهمه والحكم**

باپیر لە گەلٚ خوشکەکاندا لە کاتی برا بەشیدا – ویٚنەی برایە لە پشك و حوکمدا .

**إلا مع الأم فلا يحجبها      بل ثلث المال لها يصحبها**

جگە لە گەلٚ دایك کە ناتوانی دایك بیٚ بەشی ناتەواو بکات – بەلٚکو دایك سیٚ یەکی مالٚی بۆ هەیە و هاوریٚیەتی .

باپیر لە گەلٚ خوشکەکاندا لە کاتی برابەشیدا وەکو برا وایە ، لە تەعصیب کردنی خوشکەکادا دەیانکات بە عەصەبە ، یەکسانە خوشکی دایك و باوکی بن یا باوکی بن ، لە بەر یەکسانی هاتنیان بە باوك .

ئەگەر حاڵی باپیر برا بەشی بخوازێت باپیر دوو ئەوەندەی خوشك وەردەگرێ وەك برا ، باپیر بەشی برای بۆ هەیە ، وە حوكمی باپیر وەك حوكمی برا وایە لە بونیا كە خوشكێ یا زیاتر دەكات بە عەصەبە ، وە بەشی خوشكەكە دەگۆرێ لە نیوە یا بۆ دوو سێ یەك یا بۆ عەصەبە .

جگە لەم حاڵەتە نەبێ كە باپیر وەك برا نییە ، ئەگەر دایك لە گەڵ برا و خوشك بێ ئەوە وەك برا نییە ، كە برا لە گەڵ خوشكدا بێ دایك بێ بەشی ناتەواوی دەكات لە سێ یەكەوە بۆ شەش یەك .

بۆ دایك هەیە سێ یەكی تەواو لە مەسئەلەیەكدا كە باپیری لە گەڵ بێ وە ئەوەی دەمێنێتەوە دابەش دەكرێ لە نێوان باپیر و خوشكەكاندا بە برا بەش خوشكەكە نیوەی باپیری بۆ هەیە :

| دایك | باپیر و خوشك | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٣ | ماوە | ٣ × ٣ |
| | | ٩ |
| ١ | ٢ | |
| ٣ | ٤ - ٦ - ٢ | |

وە نازناوی هەیە ئەم مەسئەلەیە بە (خرقاء) [1].

---

١ ئەم مەسئەلەیە ناوی دەركردووە بە (خرقاء) لە بەر ئەوەی فەرموودەی هاوڕێكانی پێغەمبەر (ﷺ) تیا جیاوزی زۆرە چەند ناوی تری هەیە لەوانە :

(المثلثة) لە بەر ئەوەی حەزرەتی عوثمان ئەم مەسئەلەی لە سێ یەك گەراندوە .

(المربعة) لە بەر ئەوەی ئیبن و مسعود ئەم مەسئەلەی لە چوار یەك گێراوە ئەو فەرموودانەی پەیدا بوون لەم مەسئەلەیەدا ئەمانەی خوارەوەیە كە باسیان دەكەین :

فەرموودەی یەكەم : ئەوەیە كە دایك سێ یەك وەردەگرێ وە باباپیر بێ بەشی ناتەواوی ناكات ، لە گەڵ خوشكدا لە سێ یەك بۆ شەش یەك وەك چۆن بێ بەشی ناتەواوی دەكا براوخوشك .

فەرموودەی دووەم : گێراویانەتەوە لە حەزرەتی عومەرەوە وە ریواتێكە لە یبن مەسعود خوشك نیوە وەردەگرێ وە دایك شەش یەك وە باپیر ماوە .

هەروەهایە گەر مەسئەلەیە کە پێك هاتبێ لە ژن و دایك وباپیر و خوشکێك :

| ژن | دایك | خوشك و باپیر | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ | ماوە | ١٢ ×٣ |
| | | | ٣٦ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |
| ٩ | ١٢ | ١٥÷٣=٥ | |

---

| خوشك | دایك | باپیر | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ماوە | ٦ |
| ٣ | ١ | ٢ | |

فەرموودەی سێهەم : دەگێرنەوە لە حەزرەتی عوثمان – دایك سێ یەك وەردەگرێ و ماوە بە یەکسانی دابەش دەکرێ لە نێوان باپیر و خوشککەدا ، لە بەر ئەمەیە ناوبراو بەو (مثلثة)

| دایك | باپیر و خوشك | | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٣ | ماوە | | ٣ |
| | ٢ | | |
| ١ | ١ | ١ | |

فەرمودەی چوارەم : گێراویانەتەوە لە حەزرەتی علی – کە خوشك نیوە وەردەگرێ و دایك سێ یەك ، ماوە بۆ باپیر :

| دایك | خوشك | باپیر | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٣ | ١/٢ | ماوە | ٦ |
| ٢ | ٣ | ١ | |

فەرمودەی پێنجەم : کە ریوایەتێکی ترە لە ئیبن و مسعودەوە – خوشك نیوە وەردەگرێ وە ماوە دابەش دەکرێ لە نێوان لە باپیر و دایك دا بە یەکسانی لە بەر ئەوەیە ناو نراوە بە (المربعە) :

| خوشك | باپیر و دایك | | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە | | ٢×٢ |
| | ١ | | ٤ |
| ١ | ٢ | | |
| ٢ | ١ | ١ | |

بۆ دایك سێ یەكی تەواوە كە (١٢) پشكە ، بۆ ژن چوار یەكە كە (٩) یە ، بۆ خوشك و باپیر ماوە ، كە خوشكەكە نیوەی باپیری بۆ هەیە كە (٥) دەكات ، وە باپیر (١٠) دەكات .

واحسب بني الأب لدى الأعداد　　　　وارفض بني الأم مع الأجـــــداد

بژمێرە ئەولادی دایك لە گەڵ ئەولادی باوك و دایكی وەك یەك جۆر لە كاتی برابەشیدا لە سەر باپیر – وازی لێبێنە ئەولادی دایك لە گەڵ بونی باپیردا .

واحكم على الإخوة بعد العـــد　　　　حكمك فيهم عند فقد الجــــد

حوكم بكە بە سەر براو خوشكەكاندا لە دوای ژماردنیان -- وێنەی حوكمت تیایانا لە كاتی نەبوونی باپیر .

هەموو ئەوانەی پێش كەوت لەوەی كاتێ لە گەڵ باپیرا ئەولادی باوك و دایكی یا ئەولادی باوكی ببێ ، وە لەم دوو دێرە هۆنراوەیەدا باسی حوكمی ئەوەی كرد ئەگەر لەگەڵ باپیر ئەولادی باوك و دایكی و ئەولادی باوكی بە یەكەوە بوون هەموویان یەكسانە ، لە گەڵیانا خاوەن بەشیانە یان نە ، بژمێرە و حسێبی بكە لە سەر باپیر ئەولادی باوك لە گەڵ ئەولادی دایك و باوكیدا ، وە بیان ژمێرە لە سەر باپیر بە شێوەیە كە هەموویان یەك جۆرن ، واتە ئەگەر لە مەسەلەیەكدا برای باوكی و برای باوك و دایكی و باپیرێ بوو لە برا بەشی و سێ یەكدا بری باوكییەكە بژمێرە وادابنێ بەش دەبات كە لە بەشی نییە وە بەشەكەی دەگەڕێتەوە بۆ برای دایك و باوكیەكە .

وە مەبەست بە فەرموودەی (( بنی الأم)) بە گشتی ئەولادی باوك دەگرێتەوە نێر بن یان مێ ، هەروەها ئەولادی دایك .

لە پاشا كاتێ باپیر بەشی خۆی وەرگرت حوكم بكە بە براو خوشكەكانا حوكمی خۆت تیاندا لە كاتی نەبوونی ، بێ بەش ئەبێ ئەولادی باوك بە ئەولادی باوك و دایكی هیچی بۆ نییە و بێ بەشە مەگەر كاتێ نەبێ

ئەولادی باوكەكە یەك خوشكی دایك و باوكی ببێ لە بەشەكەی كە نیوە ، ئەوە لەو كاتەدا چی زیاد بێ بۆ ئەولادی باوكەكەیە .

نمونە : بۆ باپیر برابەشی و سێ یەك :

| باپیر | برای دایك و باوكی | برای باوكی | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٣ | ماوە | بێ بەش | ٣ |
| ١ | ٢ | | |

بۆ باپیر سێ یەك وە ماوە بۆ برای باوك و دایكی وە برای باوكی بێ بەش دەبێ ، لە پاش ژماردن و حسێب كردنی لە سەر باپیر واتە : لە كاتی بەشكردنی میرات برا باوكیەكە دەژمێری و دایبنێ كە خاوەن بەشە ، بەلاّم لە پاش باپیر كە بەشی خۆی وەرگرت برا باوكییەكە بێ بەش دەكرێ ئەو بەشەی بۆ برا باوكییەكە دانرا برای باوك و دایكییەكە بۆ خۆی وەری دەگرێ .

وە هەروەها نمونەی باپیر و برای دایك و باوك و خوشكی باوكی :

| باپیر | برا باوك دایك | خوشك باوك | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- |
| | ماوە | بێ بەش | ٥ |
| ٢ | ٣=١+٢ | | |

برا بەشی چاكترە بۆ باپیر دوو پشكی دەكەوێ لە پێنج پشك وە بۆ برا دایك و باوك سێ ماوەكەی بۆ هەیە ، خوشكەكە بێ بەش دەبێ لە دوای ژماردن و حسێب كردنی لە سەر باپیر .

مەسەلەیە:باپیر لە گەلّ خوشكێكی باوك و دایكی وبراو خوشكێكی باوكی:

| باپیر | خوشكی دایك و باوكی | براوخوشكی باوكی | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٣ | ١/٢ | ماوە | ٣×٦ |
| | | ١ | ١٨ |
| ٢ | ٣ | ٣ | |
| ٦ | ٩ | ٢ ١ | |

لەیرەدا بۆ باپیر یەكسانە برابەش و سێ یەك ، سێ یەكی بۆ هەیە ، وە زیادەكە دوو سێ یەكە كە زیاترە لە نیوەی مەسەلەكە دەدرێ بە خوشكی دایك و باوكیەكە كە نیوە ، وە زیادەكەی كە شەش یەكی مەسەلەكەیە بە براو خوشكە باوكییەكە دەدرێ دوو بەش بۆ براكە و بەشێك بۆ خوشكەكە وە راست كردنەوەی مەسەلەكە لە هەژدە دەبێت .

مەسئەلەیە : دایك و باپیر و برای دایك و باوكی خوشكی باوكی :

| دایك | باپیر | برای دایك و باوكی | خوشكی باوكی | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١/٦ | ماوە | | بێ بەش | ٦ |
| ٦ | ٥ | | | |
| ١ | ٢ | ٣=١+٢ | | |

لەیرەدا دایك شەش یەك وەردەگرێ كە پشكێكە لە شەش ، وە پێنجی دەمێنێتەوە برا بەش چاكترە بۆ باپیر دوو پشك بۆ باپیرە و سێ پشك بۆ برا دایك و باوكی ، وە خوشكی باوكی بێ بەش دەبێ .

مەسەلەیە : دایك و باپیر و خوشكی دایك و باوكی برای باوكی :

| دایك | باپیر | خوشكی دایك و باوكی | برای باوكی | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١/٦ | ماوە | | بێ بەش | ٦ |
| ٦ | ٥ | | | |
| ١ | ٢ | ٣=٢+١ | | |

دایك یەك پشكی دەكەوێ باپیر دوو پشك ، وە بۆ خوشك سێ پشك ، وە برای باوكی بێ بەش .

مەسەلەیە : دایك و باپیر و خوشكی باوكی و دیكی دوو برای باوكی :

| دایك | باپیر | خوشكی دایك و باوكی | ٢برای باوكی | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١/٦ | ماوە ١/٣ | ١/٢ | ماوە | ٢×١٨ |
| | | | | ٣٦ |
| ٣ | ٥ | ٩ | ١ | |
| ٦ | ١٠ | ١٨ | ٢ | |

بۆ دایك شەش یەك ، وە سێ یەی ماوە چاكترە بۆباپیر دادەنرێ بۆی ، ئەصڵی مەسەلەكە لە هەژدەیە (١٨) : بۆ دایك سێ ، بۆ باپیر سێ یەكی ماوە كە پێنجە دەی زیادە بۆ خوشكی باوكی و دایكییەكە نیوە كە بەشەكەی نۆیە ، وە زیادەی هەیە بۆ دوو براكە كە یەك پشكە دابەش دەكرێ لە نیوان هەردوو براكان ، لە بەر ئەوەی كەرتی تێ دەكەوێ راست دەكرێتەوە مەسەلەكە لە سێ و شەش (٣٦) اە پاشا بەشی دایك دەبێ بە شەش لە سی و شەش پشك ، وە باپیر دەبێ بە (١٠) ، وە خوشك دەبێ بە (١٨) ، وە دوو براكە بە دوو .

ئەو نیوەیە كە خوشكە باوك و دایكیەكە وەری دیەگرێ لەم وێنەدا بە بەش وەری دەگرێ لە بەر ئەوەی خوشك ئەگر تاك بوو لە نیوە زیاتر وەرناگرێ لە هەر مەسئەلەیەكدا سێ یەكی ماڵ یا سێ یەكی ماوە بۆ باپیر چاكتر بوو ئەوە وەری دەگرێ ، وە نیوەی ماڵەكە زیاد بوو یا زیاد لە نیو بوو ئەوە نیوە خوشكەكە وەری دەگرێ بە بەش وەری دەگرێ لە سەر فەرموودەی راست وەك نقڵی كردووە ئیمامی نەوەوی لە كتێبی (تصويب ) ی ئیبن و لەباب و دایان مەزراندووە وە نەقلیان كردووە كۆمەڵێك لە زەیدەوە ، ئەمە هاتووە لە سەر فەرموودەی جەماهیر : كە بەراستی بەش دانانری بۆ خوشك لە گەڵ باپیرا جگە لە مەسەلەی ئەكدەرییەدا ، وە فەرموودەی (( وارفض بنى الآم مع الأجداد )) واتە : باپیر بێ بەش بكە ئەولادی دایك نزیك بێ یا دوور لە میراتدا .

وە ئەم باسە پێش كەوت لە بابی حەجبدا لە فەرموودەی :

(( ويفضل ابن الأم بالإسقاط بالجد فافهمه على إحطياط ))

## باب الأكدرية [1]

### مەسئەلەی ئەكدەرییە

والأخت لا فرض مع الجد لها فيما عدا مسألة كملهـــــا

وە خوشك لە گەڵ باپیر بەشی نییە - جە مەسئەلەی ئەكدەرییە كە تەواوی كردووە .

زوج وأم وهما تمـــامهـــا فاعلم فخير أمة علامهـــا

مێرد و دایك ئەو دوانە مەسئەلەكەیان تەواو كردووە - بزانە چاكترینی نەتەوە زاناكەیەتی .

تعرف يا صاح بالأكدريـــة وهي بأن تعرفها حريـــة

ئەی هاوڕێ : ئەمم مەسئەلەیە دەناسرێ بە ئەكدەرییە - ئەو مەسئەلە شایانە لە بەر ئەوەی بیناسیت .

فيفرض النصف لها والسدس له حتى تعول بالفروض المجملــة

نیوە بۆ خوشك دادەنرێت و بۆ باپیریش شەش یەك - تا ئەو مەسئەلەیە عەول بكا بەو بەشە كۆكراوانە .

ثم يعودان إلى المقاســمـــة كما مضى فاحفظه واشكر ناظمه

---

(١) زاناكان جیاوازییان هەیە لە ناوبردنی ئەم مەسئەلەیە ، كۆمەڵێ دەڵێن : ئەم مەسئەلەیە كە ناونراوە بە ئەكدەرییە لە بەر ئەوەی عبدالملیكی كوری مەروان پرسیاری ئەم مەسئەلەی كرد لە پیاوێ كە ناوی ئەكدەر بوو نیسبەت دەدرێ لە پیاوەوە .

وە وتراوە لە بەر ئەوەی ژنێك لە ئەكدەر كە پێی دەوترا ئەكدەرییە مرد ئەو كۆمەڵە میراتگرانەی لێ بەجێما .

وە وتراوە لە بەر ئەوەی ئەم مەسئەلەیە ئەصڵەكەی روون نەبوو لای زەید ، لە بەر ئەوەی نەیبینیوە عەول بكرێ لە مەسائیلی باپیردا وە عەولی كرد لە مەسئەلەدا ، وە دووبارە ناونرا بە (( الغرّاء )) .

لە پاشا باپیر و خوشک دەگەڕێنەوە بۆ برا بەش – وەك رابووورد ، دەرخیکە و سوپاسی رێکخەری بکە .

مەزھەبی ئیمامی شافیعی و مالیك و جومهور لە سەر ئەوەن کە خوشك بەشی بۆ دانانرێ لە گەڵ باپیردا جگە ئەو مەسائیلانە کە هەڵژمێردراوە ، جگە لە مەسئەلەی ئەکدەرییەدا ، وێنەکەی : مێرد و دایك و باپیر و خوشك : ئەوە مەبەست نووە بە فەرمودەی (( فیما عدا مسالة کمّلها زوج وام وهما تمامها )) واتە باپیر و خوشك تەواوی مەسئەلەکەیە دەبێ ئەو ڕاناوە (هما) بگەڕێتەوە بۆ باپیر و خوشك ، وە دەشگونجێ بگەڕێتەوە بۆ مێرد و دایك :

| مێرد | دایك | باپیر | خوشك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ٢/٣ | ١/٦ | ماوە | ٦ |

نیوە بۆ مێردە لەم مەسئەلەیەدا ، وە سێ یەك بۆ دایك ، شەش یەك زیادەیە لەم مەسئەلەدا وایە کە ئەو شەش یەکە دابنرێ بۆ باپیر و خوشکەکە بێ بەش بکرێ ئیمامی ابو حەنیفە و ئەحمەد لە سەر ئەم رایەن ، وە لای ئیمامی شافیعی و مالیك و جومهور بۆ باپیر شەش یەکی ماوە دادەنرێ وە بۆ خوشك نیوە دادەنرێ ، لە بەر ئەوەی عەصەبەی خوشکەکە هەڵوەشاوەتەوە بە باپیر وە بەربەستێ نییە بێ بەشی بکات ، بەرزدەکرێتەوە بە نیوەی مەسئەلەکە کە سێ یە ، بەرز دەبێتەوە لە شەش بۆ نۆ

| مێرد | دایك | باپیر | خوشك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ٢/٣ | ١/٦ | ١/٢ | ٦ بەرزبویەوە بۆ |
| ٣ | ٢ | ١ | ٣ | ٩ |

لـە پاشـا خوشـك و بـاپیر گەرانـەوە بـۆ بـرا بـەش وە هەڵگەرانـەوە بـۆ تەعـصیب وە دابـەش دەكـرێ بەشـەكەیان بـە سـێ بەشـەوە . دوو بـەش بـۆ باپیر و یەك بەش بۆ خوشك :

| مێرد | دایك | خوشك | باپیر | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١/٢ | ١/٣ | ١/٢ | ١/٦ | ٦ بەرز دەبێتەوە بۆ |
| ٣ | ٢ | ٣ | ١ | ٩ |
| ٩ = ٣×٣ | ٦=٣×٢ | بـــرا بـەشی ماوە | | ٣×٩ |
| | | ٣+١=٤ للمذكر مثل حظ الأنثيين | | ٢٧ |
| | | ١٢=٤×٣ | | |

چوار دابەش ناكرێ بە سەریاندا چونكە كـەرتی تـێ دەكـەوێ خوشـك و باپیر سێ دەكا سێ كەرەتی مەسئەلەكە دەكەین ٣×٩=٢٧ دەكات :

بـۆ مێـرد (٩) هەیە ، وە بـۆ دایـك ( شـەش ) هەیـە ، وە بـۆ خوشـك (٤) هەیە ، وە بۆ باپیر ( ٨) .

دەنگیان لێ هاتووە بەو مەسئەلە : واتە : پەرلەیان هێناوەتەوە ، وتراوە لە ناو چوو لە ناو چوویە وە چوار كەس لە میرات گرانی لە دوا بەجێ ما ، تایبـەت بـوو یـەكێكیان بـە سـێ یـەكی مـاڵ ، دووەم بـە سـێ یـەكی مـاوە ، سێهەم بە سێ یەكی ماوەی ماوە ، چوارەم ماوە .

لە ناوچوو لە ناوچوویە مەبەست ژنەكەیە ، یەكەمیان مێرد و دووەم : دایك ، سێهەمیان : خوشك ، چوارەمیان باپیر .

وە فـەرموودەی (( والأخـت لا فـرض مـع الجـد لهـا – إلا في هـذه المسألة الأكدريـة )) هاتووەتـە سـەری چـەند مەسـائیلێ ئاگـادارم كردووەتـەوە لـە سەری لە ( كشف الفوامض ) و شەرحەكەی و جگە ئەو دوانە بگەرێرەوە بۆ لای .

## باب الحساب

### حیسابی مەسائیلی فەرائیض

واتە : حیسابی مەسائیلی فەرائیض ، ئەوە وەصل و بنچینە و راستە کردنەوەیە ، نەك زانینی ئەو حیسابەی ناسراوە ، لە گەڵ ئەوەی پێویستە لە زانینی حیساب بۆ کەسێ بیەوێ بە پوختەیی زانیاری فرائض بزانێ [(١)] .

**وإن ترد معـرفة الحســاب　　　لتنـــتهي فيه إلــى الصــواب**

ئەگەر دەتەوێ زانیاری حیساب – بۆ ئەوەی بگەیتە ئەنجامی راستی .

**وتعرف القسمة والتفصـيلا　　　وتعلم التصحيـح والتأصيــلا**

وە بزانــی دابەش کـردن بـۆ میراتــەکان و درێــژەی – وە بزانـی راسـت کردنەوەی و ئەصڵی مەسائیلەکانی .

**فاستخرج الأصول في المسائل　　　ولا تكـن عن حفظها بــذاهل**

دەری بکــە ئەصــڵەکان لــە مەســائیلەکانا – وە بــێ ئاگــا مەبــە لــە دەرخکردنی ئەصڵی مەسئەلەکان .

**فــإنهــن ســبعة أصـــول　　　ثــلاثــة منهــن قــد تعــول**

بەراستی ئەصڵی مەسئەلەکان حەوت ئەصڵە – سیانیان لەو حەوتە کەم جارێ زیاد دەکا .

**وبعدهـــا أربعــة تمـــام　　　لا عــــول يعروهـــا ولا انثلام**

لـە دوای ئـەو سـیانە باسـکرا چـواری تـەواوە – عـەول داینا پۆشـی و داناباریێ بە سەریانا وە خەلەلیش .

---

(١) مغنی المحتاج ٣/٣ دا دەفەرموێ : زانینی زانستی فرائض پێویستی بە زانینی سێ جۆرە لە زانست هەیە :

زانینی زانست بە فەتوا .

زانینی زانست بە نەسەب .

زانینی زانست بە حیساب .

**فالسدس من ستة أسهم يرى　　　　والثلث والربع من اثنى عشرا**

شەش یەك لە شەش تیر بینراوە—وە شەش یەك وچوار یەك لە دوانزە .

**والثمن إن ضم إليه السدس　　　　فأصله الصادق فيه الحدس**

وە هەشت یەك ئەگەر شەش یەك درایە پاڵی – ئەصڵی مەسەلەكەی راست بێ و تەخمینی تیا بێ .

**أربعة يتبعها عشرونا　　　　يعرفها الحساب أجمعونا**

چوار كە بە دوایا بێت بیست – هەموو ژمێریاری دەیناسێ بیست و چوارە .

**فهذه الثلاثة الأصول　　　　إن كثرت فروضها تعول**

ئائەمە سێ ئەصڵە – ئەگەر زۆر بوو تیرەی خاوەن بەشەكان بە سەر مەسەلەكەدا زیاد دەكرێ .

هەموو مەسەلەیە شەش یەك و ماوەی تیدا بوو ئەصڵی مەسەلەكە لە شەشە وەك دایك و كوڕ :

| دایك | كوڕ | مسئلە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | ماوە | ٦ |
| ١ | ٥ | |

وەك : باوك و دایك و كوڕ :

| باوك | دایك | كوڕ | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | ماوە | ٦ |
| ١ | ١ | ٤ | |

ئەصڵی مەسەلەكە لە شەشە .

ئەگەر لە گەڵ شەش یەكدا نیوە یا سێ یەك بێ ، وەك دایك و كچێك و مام :

| دایك | كچ | مام | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٢ | ماوە | ٦ |
| ١ | ٣ | ٢ | |

وەك دایك و دوو برای دایكی و مامێ :

| دایك | ٢برای دایك | مام | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٦ |
| ١ | ٢ | ٣ | |

وەك دایك و دوو كچ و مامێ :

| دایك | ٢كچ | مام | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ٢/٣ | ماوە | ٦ |
| ١ | ٤ | ١ | |

هەروەها ئەصڵی مەسەلەكە لە شەشە ئەگەر نیوە یا سێ یەكی تیابوو وەك مێرد و دایك و مام :

| مێ{د | دایك | مام | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ماوە | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | |

وە هەروەها مەسئەلەیە کە چواریەك و شەش یەکی تیابێ ئەوە ئەصلی مەسئەلەکە لە دوانزە ، وەك مێرد و دایك و کوڕ :

| مێرد | دایك | کوڕ | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٢ | ٧ | |

هەروەها ئەگەر لە گەڵ چواریەکدا سێ یەك یا دوو سێ یەك بێ ، وەك : ژنێك و دایك و مام :

| ژنێك | دایك | مام | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |

وەك مێرد و ٢كچ و مامێ :

| مێرد | ٢كچ | مام | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ٢/٣ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٨ | ١ | |

لە زۆر نوسخەدا هاتووە : (( والثلث والربع و من اثنی عشرا)) سێ یەك و چواریەك لە دوانزەیە کە ئەمە راستە ، وەك دایك و مێرد و مام :

| مێرد | دایك | مام | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |

وە هەروەها مەسئەلەیەك هەشت یەك و شەش یەکی تیابێ ئەصڵی مەسئەلەکە لە بیست و چوارە ، ئەوە مانای فەرموودەی (( أربعە یتبعها عشرونا )) چوار کە بە دوایا بێ بیست ، وەك کوڕێك و ژنێك و دایکی :

| ژنێك | دایك | کور | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٨ | ١/٦ | ماوە | ٢٤ |
| ٣ | ٤ | ١٧ | |

وە هەروەها ئەگەر لە هەشت یەکدا دوو سێ یك بێ ، وەك ژنێك و دوو کچ و ئازادکارێ :

| ژنێك | ٢کچ | ئازادکار | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٨ | ٢/٣ | ماوە | ٢٤ |
| ٣ | ١٦ | ٥ | |

وە فەرموودەی (( الصادق فیە الحدس )) راست بێ و تەخمینی تیابێ زیادەیە لە بەر قافیەی هۆنراوەکە هاتووە وە (الحدس) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای گومان و تەخمینە .

ئەم سێ ئەصڵەیە { ٦- ١٢- ٢٤ } بەرز دەکرێتەوە کاتێ زۆر بوو بەشەکانی وە زیادی بوو کۆی هەموی بە سەر ماڵەکەدا وەك : مێرد و ٢خوشکی دایکی و دوو خوشکی باوکی :

| مێرد | ٢خوشکی دایکی | ٢خوشکی باوکی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ٢/٣ | ٦ بەرز بوویەوەبۆ |
| ٣ | ٢ | ٤ | ٩ |

بەراستی لە مەسئەلەکەدا نیو و سێ یەك و دوو سێ یەك ، هەموو یەکێك لە خاوەن بەشەکان کە تایبەتیان دەکرد لەو ماڵە بە گوێرەی

بەشەکانیان ، کۆبویەوە تیرەکانیان لە گەڵ ئەصڵی مەسئەلەکە ، دابەش کرا ماڵەکە لە سەر کۆی تیرەکان دەرچوو بەشی هەمو تیرێ ، ئا ئەوە عەولە ، لە بەر ئەوەی عەول لە زمانی عەرەبیدا بەرز بوونەوە و زیادەیە ، لە زاراوەی زاناکان زیادەیەکە لە ژمارەی تیری ئەصڵی مەسئەلەکە ، وە کەمی لە ئەندازەی دانانەکان .

**فتبلغ الستة عقد العشرة      في صورة معروفة مشتهرة**

لە زیادبووندا شەش دەگاتە گرێی دە – لە وێنەیەکی زانراوی بە ناوبانگ .

**وتلحق التي تليها بالأثر      في العول إفرادا إلى سبع عشر**

دەلکێ بە شەش ئەوەی دێت بە دوایا کە دوانزەیە لە پاشماوە – زیاد بوون بە تاکی ژمارە تا حەڤدە .

**والعدد الثالث قد تعول      بثمنه فاعمل بما أقول**

وە ژمارەی سێهەم کە بیست و چوارە کەم جارێ زیاد دەکرێ – بە هەشت یەکی خۆی کە سێ یە ، کار بکە بەوەی دەیڵێم .

دەستی کرد بە روون کردنەوەی زیادبوونی (عول) لەو سێ ئەصڵەدا کە { ٦ – ١٢ – ٢٤ } وە ئەوەی پێی دەگات هەموو یەکێ لەو ئەصڵانە بە زیادکردن ، شەش زیاد دەکرێ بۆ حەوت ، بۆ هەشت ، بۆ نۆ ، بۆ دە ، زیاد دەکات چوار جار لە سەر یەك بە دوای یەکدا ژمارەکان تاوەکو دەگاتە دە ، وە ئەم دەیە وێنەیەکی زانرا و بەناوبانگە بە ( أمّ الفروخ) وە لەمەولا دێت .

شەش زیاد دەکات بۆ حەوت لە مێرد و دوو خوشکی باوك و دایکی یا بابوکی یا جیاواز بن :

| مێرد | ٢خوشکی دایکی | مسئلە |
|---|---|---|
| ١/٢ | ٢/٣ | ٦ بەرزبوویەوە بۆ |
| ٣ | ٤ | ٧ |

| مێرد | خوشکی باوك ودایکی | خوشکی باوکی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٢ | ١/٦ | ٦ بەرزبوویەوە بۆ |
| ٣ | ٣ | ١ | ٧ |

بۆ مێرد نیوه كه سێ یه ، وه بۆ خوشكەكه دوو سێ یەكه كه چواره ، وه هەمووی حەوته ، ماڵەكه دابەش دەكرێ له نێوانیاندا به حەوت بەش بۆ مێرد نیوه بەرزەوه بوو كه له حەوتا سێ یه ( $\frac{٣}{٧}$ ) ، وه بۆ دوو خوشكەكه دوو سێ یەكی بەرزەوەبوو ( $\frac{٤}{٧}$ ) كه له حەوتا چواره.

وه لەم مەسئەلەدا شەش بەرزدەبێتەوه بۆ حەوت وەك : دایك و دوو برای دایكی و دوو خوشكی باوكی :

| دایك | ٢برای دایكی | ٢خوشكی باوكی | مسئله |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٦}$ | $\frac{١}{٣}$ | $\frac{٢}{٣}$ | ٦ بەرز بوویەوه بۆ |
| ١ | ٢ | ٤ | ٧ |

وه شەش بەرزدەبێتەوه بۆ هەشت ، وەك دایك و مێرد و دوو خوشكی باوكی :

| مێرد | دایك | ٢خوشكی باوكی | مسئله |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٢}$ | $\frac{١}{٦}$ | $\frac{٢}{٣}$ | ٦ بەرزبوویەوه بۆ |
| ٣ | ١ | ٤ | ٨ |

وەك : مێرد و دایك و خوشكی باوك و دایكی یا باوكی / نازناوی هەیه ئەم وێنەیه به (مُباهلة) :

| مێرد | دایك | ٢خوشكی باوك ودایكی | مسئله |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٢}$ | $\frac{١}{٣}$ | $\frac{١}{٢}$ | ٦ بەرزبۆ |
| ٣ | ٢ | ٣ | ٨ |

لەم دوو وێنەیەدا نیوەی مێردەكەدەبێت به چوار یەك و هەشت یەك وه بەشی دایكەكه له وێنەی یەكەمدا دەبێ به هەشت یەك ، وه له وێنەی دووەمدا دەبێ به چوار یەك .

وه شـەش بەرزدەبێتـەوە بـۆ نـۆ وەك : مێـرد و دایـك و سـێ خوشـكی جیاواز :

| مێرد | دایك | خوشكی باوك و دایكی | خوشكی دایكی | خوشكی باوكی | مسئلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ | ٦ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ١ | ٣ | ١ | ١ | ٩ |

بۆ مێرد نیو ، وە بۆ خوشكی باوك و دایكی نیو ، وە بـۆ هـەموو یـەكێك لەو سیانە ماوە شەش یەك .

وەك : مێـرد و دوو خوشـكی دایكی و دوو خوشـكی بـاوك و دایكـی یـا باوكی ، نازناوی ئەم وێنەیە بە (الغرّاء ) بەناوبانگە وەك ( كوكب الاغر ) :

| مێرد | ٢خوشكی دایكی | ٢خوشكی باوك ودایكی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ٢/٣ | ٦ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ٢ | ٤ | ٩ |

وە شـەش بەرزدەبێـەوە بـۆ دە ، وەك مێـرد و دایـك و دوو خوشـكی دایكی و خوشكێكی باوك و دایكی و خوشكێكی باوكی :

| مێرد | دایك | ٢خوشكی دایكی | خوشكی باوك و دایكی | خوشكی باوكی | مسئلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٣ | ١/٢ | ١/٦ | ٦ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ١٠ |

وەك مێرد و دایك و دوو خوشكی دایكی و دوو خوشكی باوكی :

| مێرد | دایك | ٢خوشكی دایكی | ٢خوشكی باوكی | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٣ | ٢/٣ | ٦ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ١ | ٢ | ٤ | ١٠ |

ناوبانگی دەرکردووە بە (ام الفروخ ) تەشبیە مانەندکراوە بە باڵندەیە کە بێچوەکانی بە چواردەورا بێ ، لە بەر زۆری بەرزبوونەوەی .

وە دووبارە ناونراوە بە (ام الفروج) لە بەر ئەوەی زۆربەی ئەوانەی لەم مەسەلەدا ژنە .

وە ناوبراوە بە (البلجاء) لە بەر روونی ئەم مەسئەلە .

وە ناوبراوە بە ( الشریحیة) لە بەر ئەوەی ئەم مەسئەلەیە لەو مەسئەلانەیە کە قازی شورەیح حوکی تێدا کردووە .

وە دوانزە سێ جار بە دوای یەکدا بە تاکی بەرز دەبێتەوە : بۆ سیانزە ، وە بۆ پانزە ، وە بۆ حەڤدە :

دوانزە بەرزدەبێەوە بۆ سیانزە وەك : دوو کچ و دایك و مێرد :

| مێرد | ٢کچ | دایك | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ٢/٣ | ١/٦ | ١٢ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ٨ | ٢ | ١٣ |

وەك ژنێك و دایك و خوشکێکی دایکی و خوشکیٚ:ی باوکی :

| ژن | دایك | ٢خوشکی دایکی | ٢خوشکی باوك ودایکی | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ١/٦ | ١/٢ | ١٢ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ٢ | ٢ | ٦ | ١٣ |

وە دوانزە بەرزدەبێتەوە بۆ پانزە وەك دوو کچ و مێرد و باوك و دایك :

| مێرد | ٢کچ | باوك | دایك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ٢/٣ | ١/٦ +ماوە | ١/٦ | ١٢ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ٨ | ٢ | ٢ | ١٥ |

وەك ژنێك و دوو خوشكی دایكی و دوو خوشكی باوكی :

| ژن | ٢خوشكی دایكی | ٢خوشكی باوكی | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ | ٢/٣ | ١٢ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ٤ | ٨ | ١٥ |

وە دوانزە بەرزدەبێتەوە بۆ حەڤدە وەك ژنێك و دایك و دوو برای دایكی و دوو خوشكی باوكی :

| ژن | دایك | ٢برای دایكی | ٢خوشكی باوكی | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ١/٣ | ٢/٣ | ١٢ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ٢ | ٤ | ٨ | ١٧ |

وەك : دوو نەنك و سێ ژن و چوار خوشكی دایكی و هەشت خوشكی دایك و باوكی :

| ٣ژن | ٢نەنك | ٤خوشكی دایكی | ٨خوشكی باوك ودایكی | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ١/٣ | ٢/٣ | ١٢ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ٢ | ٤ | ٨ | ١٧ |

ئەم وێنە ناوبراوە بە (الارامل) وە بە ( ام الفروج)) لە بەر ئەوەی هەمووە مێینەیە ، وە بە ( السبعه عشریه) .

وە بیست چوار ئەصڵی سێیەمە لەو سێ ئەصڵەیە كە زیاد دەكرێت ئەم ئەصڵە كەم جارێ زیاد دەبێ .

وە ناوبراوە بە ( المسئلة البخیلة ) مەسەلەی رژد لە بەر ئەوەی كەم زیادی تیا دەكرێ ، وە زیادكردنەكەی یەك جارە بۆ هەشت یەكی خۆی كە سێ یە بۆ بیست حەوت :

وەك چوار كچی كوڕ و چوار نەنك و باپیر و سێ ژن :

| مسئله | باپیر | ٤نەنك | ٢كچی كوڕ | ٣ژن |
|---|---|---|---|---|
| ٢٤ بەرز بوویەوە بۆ | ١/٦ | ١/٦ | ٢/٣ | ١/٨ |
| ٢٧ | ٤ | ٤ | ١٦ | ٣ |

وەك : ژنێك و دوو كچ و باوك و دایك :

| مسئله | دایك | باوك | ٢كچ | ژن |
|---|---|---|---|---|
| ٢٤ بەرز بوویەوە بۆ | ١/٦ | ١/٦ +ماوە | ٢/٣ | ١/٨ |
| ٢٧ | ٤ | ٤ | ١٦ | ٣ |

ئەم وێنەیە ناوبراوە بە ( المنبریە ) (١) .

والنصف والباقي أو النصفان أصـلهما في حكمـهم اثنـان

هەموو مەسەلەیە نیو و ماوە یا دوو نیوی تیابێ – ئەصڵی مەسئەلەكەیان لە حوكم زاناكاندا دووە .

والثلث من ثلاثة يكون والـربع من أربعـة مسنون

وە سێ یەك ئەصڵی مەسئەلەكەی لە سێ دەبێ – وە چوار یەك لە چوارە رێگاكەی باس كراوە لای ژمێریار .

---

(١) لە بەر ئەوەی دەگێرنەوە حەزرەتی عەلی وتاری دەخوێندەوە لە سەر مینبەری كوفە فەرمووی ( الحمد لله الذلي يحكم بالحق قطعا ، ويجزي كل نفس بما تسعى واليه المآب والرجعى ) وتارەكەیان لەم كاتەدا پێی بڕی ، وە پرسیاریان لێ كرد لەم مەسەلەدا ، ئەویش كوتوپڕ فەمووی ( صار ثمن المراة تسعا ) هەشت یەكی ژنەكە گەڕا بە نۆیەك ، واتە : لە جیاتی ئەوەی لە بیست و چوار سێ وەرگێ لە بیست و حەوت سێ وەردەگرێ ، پاشان وتارەكەی تەواو كرد ، بۆیە بەرزیان كردەوە لە بەر ئەوەی كەمیەكە بڕواتە سەر هەموویان ، اعانة الطالبين ٢٤٣/٢ .

**والثمن إن كان فمن ثمانية        فهذه هي الأصول الثانية**

وه هەشت یەك ئەگەر تەنها خۆی بوو لە هەشتە – ئەم چوار ئەصڵە ئەوە ئەصڵی دووەمە .

**لا يدخل العول عليها فاعلم        ثم اسلك التصحيح فيها تسلم**

زیادە ناڕواتە سەریان بزانە – لە پاشا ڕێگای ڕاست کردنەوە بگرە پارێزراو دەبیٚ لە هەڵە .

دانەر لە کاتێکدا لیٚ بوویەوە لە ڕوون کردنەوەی بەشی یەکەم لە ئەصڵی مەسئەلەکان ، ئەو سیٚ ئەصڵە بوو کە زیاد دەکران ، ئێستا دەستی کردە ڕوون کردنەوەی بەشی دووەم ، ئەویش ئەو چوار ئەصڵەیە کە زیاد ناکریٚ .

هەموو مەسئەلەیە نیو و ماوەی تێدا بیٚ وەك : مێرد و مام :

| مێرد | مام | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٢ | ماوه | ٢ |
| ١ | ١ | |

یا دوو نیوەی تێدا بیٚ وەك : مێرد و خوشکێکی باوك و دایکی یا باوکی :

| مێرد | خوشکی دایك و باوکی | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٢ | ٢ |
| ١ | ١ | |

| مێرد | خوشکی باوکی | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٢ | ٢ |
| ١ | ١ | |

ئەصڵیٚ مەسئەلەکە لەدووە ئەم دوو وێنە دواییە . ناونراوە بە ( نصفین ) لە بەر ئەوەی هەموو یەکی لەو دوانە دوو نیوەی تێدایە . وە پیٚی دەوترێت (یتیمین) لە بەر ئەوەی وێنەیان نییە .

وه هه‌موو مه‌سئه‌له‌یه سیٚ یه‌ك و ماوه‌ی تیابیٚ وه‌ك : دایك و مامه

| دایك | مام | مسئله |
|---|---|---|
| $\frac{١}{٣}$ | ماوه | ٣ |
| ١ | ٢ | |

وه یا دوو سیٚ یه‌ك و ماوه‌ی تیٚدا بیٚ وه‌ك : دوو كچ و مام :

| ٢كچ | مام | مسئله |
|---|---|---|
| $\frac{٢}{٣}$ | ماوه | ٣ |
| ٢ | ١ | |

وه یا سیٚ یه‌ك و دوو سیٚ یه‌كی تیٚدا بیٚت وه‌ك : دوو خوشكی دایكی و دوو خوشكی باوكی :

| ٢خوشكی دایكی | ٢خوشكی باوكی | مسئله |
|---|---|---|
| $\frac{١}{٢}$ | $\frac{٢}{٣}$ | ٢×٣ |
| | | ٦ |
| ١ | ٢ | |
| ٢ | ٤ | |

ئه‌صلی ئه‌و مه‌سئه‌لانه سیٚ یه .

وه هه‌موو مه‌سئه‌له‌یه‌ك چوار یه‌ك و ماوه‌ی تیٚدا بیٚت وه‌ك میٚرد و كوڕیٚك :

| میٚرد | كوڕ | مسئله |
|---|---|---|
| $\frac{١}{٤}$ | ماوه | ٤ |
| ١ | ٣ | |

وه یا چوار یەك و نیوه و ماوەی تێدا بیٚ وەك مێرد و كچ و مام :

| مێرد | كچ | مام | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٤ | ١/٢ | ماوه | ٤ |
| ١ | ٢ | ١ | |

ئەصڵی ئەو دوو مەسئەلە چوارە

وەهەر مەسئەلەیەك هەشت یەك و ماوەی تێدا بیٚ وەك :ژنێك و كوڕیٚ :

| ژن | كوڕ | مسئله |
| --- | --- | --- |
| ١/٨ | ماوه | ٨ |
| ١ | ٧ | |

وه یا هەشت یەك و نیوه و ماوەی تێدا بیٚ وەك ژنێك و كچێك و مامیٚ :

| ژن | كچ | مام | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٨ | ١/٢ | ماوه | ٨ |
| ١ | ٤ | ٣ | |

وه فەرموودەی ( من أربعه مسنون ) ( السنن) واته : ڕێگا ئەم چوار ئەصڵه { ٢ – ٣ – ٤ – ٨ } زیاد ناكرێن وەك رابووردن كاتیٚ زانیت ئەصڵی مەسئەله ڕێگای راست كردنەوه بگره بەر له دوای ئەوه پارێزراو ددەبیٚ له هەڵه كردن له دابەش كردنا ، راستی مەسئەله دێت له ئەصڵەكەی ، وه كەم جاریٚ پێویستی هەیه بۆ كەرەت كردن وه روونكردنەوەی دێت .

وإن تكــن من أصلهــا تصح          فترك تطــويل الحســـاب ربح

ئەگەر مەسئەلەكه راست دەبوویەوه له ئەصڵی مەسئەلەكه – وازهێنان له درێژەدانی حیساب قازانجه .

**فأعط كلا سهمه من أصلهــــا　　　　مكمــلا أو عائــلا من عولهــــا**

بەشی خۆی بدە بە هەموو یەکێك لە میرات بەر لە ئەصڵی مەسئەلەکە — بە تەواوی یا لەوەی زیاد دەکرێ لە زیادەکەی .

ئەگەر مەسئەلەیە راست دەبوویەوە لە ئەصڵی مەسئەلەکەی بەم شێوە دابـەش دەکـرا بەشـی هـەموو یـەکێك لـە مـیرات بـەران بـە سـەر ژمـارەی سەرەکانیا ، واتە : کەرەتی تێ نەدەکەوت ، وەك : دایك و دوو مام :

| دایك | ٢مام | مسئله |
| --- | --- | --- |
| ١/٣ | ماوه | ٣ |
| ١ | ٢ | |

وە یان وەك : مێرد و ٣کور :

| مێرد | ٣كوڕ | مسئله |
| --- | --- | --- |
| ١/٤ | ماوه | ٤ |
| ١ | ٣ | |

وە یان وەك : ٣ ژن و دایك و پێنج مام :

| ٣ژن | دایك | مام | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٤ | ١/٣ | ماوه | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |

وەك (ام الأرامل) کە لەمـەو دوا باسـی دەکـات ، کـورت هـەڵدەهێنرێ لـە دابـەش کردنـدا لـە سـەر ئەصـڵی مەسـئەلە ، وە پێویـستی نییـە بـۆ راسـت کردنەوە وە کەڕەت ناکرێ هەندێك لە سەرەکان لە هەندێکیا ، ئەوەی پەیدا دەبێ لە ئەصڵی مەسئەلە وە سەیر مەکە لە نێوان سـەرەکان و تیرەکـان ، لـە بەر ئـەوەی ئـەوە درێژەدانـە لـە حیسابدا بـێ سـوودە ، وازهێنـان لـەو درێـژە

قارانجە و ئاسان كارييە ، بيدە بە هەموو ميرات بەرێ بەشى خۆى لە ئەصلّى مەسئەلەكە بە تەواوى ئەگەر مەسئەلەكە (عول) زيادنەكرا . وە بەرزكرايەوە ئەگەر زيادى تێدا كرا : لە ٣ژن و دايك و پێنج مام :

| ٣ژن | دايك | ٥مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |

ئەصلّى مەسئەلەكە لە دوانزەيە وە لەوەش دروست دەبێ . چواريەك كەسێ تيرە لە سەر سێ ژنەكە دابەش دەكرێ بۆ هەموو يەكێكيان تيرێك ، وە سێ يەك كە چوار تيرە بۆ دايك ، وە ماوە كە پێنجە دابەش دەكرێت بە سەر مامەكاندا يەكى تيرێكيان دەكەوێ .وە لە (المباهلة) كە دايك و مێرد و خوشكێكى باوكييە:ئەصلّى مەسئەلەكە شەشە بەرز دەكرێتەوە بۆ هەشت :

| مێرد | دايك | خوشكى باوك | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ١/٢ | ٦ بەرز بوويەوە بۆ |
| ٣ | ٢ | ٣ | ٨ |

بۆ دايك سێ يەكى بەرزكراوى هەيە كە دوو تيرە لە هەشت ، وە لە راستيدا بەشەكەى چوار يەكە ، وە بۆ هەموو يەكێ لە مێرد و خوشك نيوى بەرزكراويان بۆ هەيە كە ($\frac{٣}{٨}$) سێ لە سەر هەشت .

وە لە مەسئەلەى (ام الارامل) دا كە دوو نەنك و ٣ژن و چوار خوشكى دايك و هەشت خوشكى باوك و دايكى : ئەصلّى مەسئەلەكە لە ١٢ يە وە بەرزدەكرێتەوە بۆ ١٧ :

| ٣ژن | ٢نەنك | ٤خوشكى دايك | ٨خوشكى باوك و دايك | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ١/٣ | ٢/٣ | ١٢ بەرزبوويەوە بۆ |
| ٣ | ٢ | ٤ | ٨ | ١٧ |

بۆ دوو نەنك شەش یەكی بەرزكراوە ، كە دوو تیرە لە حەڤدە تیر بۆ هەریەكێكیان لە نەنك تیرێ .

وە بۆ ژنەكان چواریەكی بەرزكراوە كە سێ تیر دەكات لە حەڤدە بۆ هەریەكێكیان لە ژنەكان تیرێ .

وە بۆ خوشكە دایكییەكان سێ یەكی بەرزكراوە كە چوار تیر دەكات بۆ هەر خوشكێك تیرێ .

وە بۆ خوشكە دایك و باوكییەكان دوو سێ یەكی بەرزكراوە كە هەشتە بۆ هەریەكێكیان تیرێك .

مەسئەلەكە بەرزكرایەوە بۆ ١٧ وە ژمارەی میرات بەران ١٧ یە وە میراتەكەش تێدا ١٧ دینارە وە لە بەر ئەوە ناونراوە ( السبعة العشرية ) .

## باب السهام

## دابەش كردنی بەشەكان

وإن ترى السهام ليست تنقسم		على ذوي الميراث فاتبع ما رسم

ئەگەر بينيت بەشەكان دابەش نەدەكرا – لە سەر خاوەن ميرات بەران شوێنی شوێنەواری زاناكان بكەوە كە كێشاوێنە .

واطلب طريق الاختصار في العمل		بالوفق والضرب يجانبك الزلل

بگەرێ بە شوێن رێگای كورت لە كاركردندا – بە موافقە لە نێوان بەش و سەری ميرات بەران وە كەڕەت كردن دەتپارێزێ لە هەڵە .

واردد إلى الوفق الذي يوافق		واضربه في الأصل فأنت الحاذق

بيگێڕەوە بۆ ئەو كۆمەڵەی موافقە دەكات – كەڕەتی بكە لە ئەصڵی مەسئەلەكە تۆ شارەزايت .

إن كان جنسا واحدا أو أكثرا		فاحفظ ودَعْ عنْكَ الجِدالَ والمِرا

ئەگەر كۆمەڵێكی تەنها بوو يا زياتر – دەرخيكە و واز بێنە لە خۆت موجادەلە لە سەر بەتاڵ .

ئەگەر بەشی هەموو كۆمەڵێك لە ئەصڵی مەسئەلەكەدا دابەش نەدەكرا بە سەر ژمارەی سەری كۆمەڵەكەی خۆی لە ميرات بەر بە دابەش كردنێكی تەواو بە بێ كەڕت – بەم شێوەيە كەرتی تێ دەكەوت ، بەشی كۆمەڵێك يا زياتر – پێويستە شوێنی ئەو شوێنەوارەی خەتيان كێشاوە زاناكان بكەوێت .

وە بگەرێت بە شوێن رێگايەكی كورتدا لە كاركردن بە موافقە ، ئەوەيە گەڕان بە شوێنێ موافقە لە نێوان بەشی هەموو كۆمەڵێ .

وە ژمارەی سەرەكانيان وە لە نێوان سەرەكان هەندێكيان لە گەڵ هەندێكيانا كەڕەتی بكە لە ئەصڵی مەسئەلەكە وە كار بكە بە موافقە و

کەڕەتەکە وەك مێرد و نەنك ٤مام :

| مێرد | نەنك | ٤مام | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٢ | ١/٦ | ماوە | ٢ ٠ ٦ |
| | | | ١٢ |
| ٣ | ١ | ٢ | |
| ٦ | ٢ | ٤ | |

ئەم نمونە ئەصڵی مەسئەلەکە لە شەشە :

وە بەشی مێرد سێ تیرە لە شەش کە نیوە .

وە بەشی نەنك شەش یەکە کە یەك تیرە .

وە بەشی مامەکان دوو تیرە کە ماوەیە ئەم دوو تیرە دابەش ناکرێ بە سەر چوار مامدا لە بەر ئەوە مەسئەلەکە راست دەکەینەوە ئەویش بە کەڕەت کردن بە موافەقەی سەری مامەکان کە (٢) لە نێوان ژمارەی مامەکان و تیرەکان واتە : موافەقە و ڕێکەوتن هەیە بە نیو .

وە پەیدا بوونی کەڕەتەکە ( ٦×٢ = ١٢ ) ئەوە راست کردنەوەی مەسئەلەکەیە کە ژمارە (٢) کە موافەقەکەی سەری مامەکانە کەڕەتی ٢ دەکەین لە بەشی هەموو کۆمەڵی میرات بەر لەو کاتەدا بەشی هەموو کۆمەڵێ دابەش دەکرێ بە سەر کۆمەڵەکەیدا ، لە بەر ئەوەی هەموو مەسەلەیەك ئەگەر کەڕەت کرا سەری کۆمەڵێکیان لە هەندێك .

وە ئەوەی پەیدا بوو لە ئەصڵی مەسئەلەکەدا راستە دابەش کردنی لەوەی پەیدا بووە یەکسانە کەرتی تێدا بێ لە سەر هەموو کۆمەڵەکە ، یا لە سەر هەندێ لە سەر ڕێگای ( تباین) یا (توافق) یا کەرتی تێدا نەبوو ئەگەر کەرتی تێدا نەبوو مەسئەلەکە دروست دەبێت بە بێ ئەوەی پێویستی کەڕەت کردن بێ وەك زانیت .

وە ئەگەر کەرتی تێدا بوو بەڵام پێویستی کەرەتی سەرەکان نەدەکرد لە سەرکاندا وەك کەسێك بە جێی هێشتبێت پێنج نەنك و پێنج برای دایکی و پێنج مام :

| نەنك | دایك | مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٥×٦ |
| | | | ٣٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٥ | ١٠ | ١٥ | |

ئەصڵی مەسئەلەکە لە شەشە : بۆ نەنکەکان شەش یەکە کە یەك تیرە (مباین) واتە ناهەموار یا جیاوازی ژمارەکەیانە ، وە بۆ براکان سێ یەکە کە دوو تیرە (مباین) ی ژمارەکەیانە .

وە ماوە سێ یە بۆ مامەکان کە (مباین) ی ژمارەیانە ، کەرەتی بکە ژمارەی سەری کۆمەڵێکیان کە پێنجە لە ئەصڵی مەسئەلەکە کە شەشە راست کردنەوەی مەسئەلەکە دێت لە سی (٣٠) یە ، ئەگەر کۆمەڵەکان هەندێکیان کەرەت بکرایەلە هەندێکیاندا ئەوەی پەیدا بوو کە ئەصڵی مەسئەلەکە راست دەبویەوە لە (٧٥٠) حەو صەد و پەنجا :

| نەنك | دایك | مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ١٢٥ =٥×٥×٥ |
| | | | ١٢٥×٦ |
| ١ | ٢ | ٣ | ٧٥٠ |
| ١٢٥ | ٢٥٠ | ٣٧٥ | |

ئەگەر مەسئەلەیە راست بێتەوە بە ژمارەیەکی کەم وەك ئەم نمونەیە کە لە ژمارەی (٣٠) مەسئەلەکە راست دەبێتەوە ، وە راست کردنەوەی لە ژمارەیەکی زۆر وەك ئەم نمونەیە هەڵەیە لە پیشەی حیساب ، ئەگەر رێگا بگرێ ژمێریار ریگایەکی کورت بە (توافق) و کەرەت دەپارێزرێ لە هەڵە .

ئـەوە سـەیر بکـە ئەگـەر کـەرەت لـە سـەر کۆمـەڵێك بـوو . وە تیردکـان (تباین) ی ژمارەی ئەو کۆمەڵە بوو کە کـەرەتی تیا بـوو وەك : دایـك و پیـنج مام :

| دایك | ٥مام | مسئلە |
|---|---|---|
| ١/٣ | ماوە | ٥×٣ |
| | | ١٥ |
| ٥×١ | ٥×٢ | |
| ٥ | ١٠ | |

کەرەتی بکە ژمارەی سەری مامـەکان کە پێنجە لـە ئەصـڵی مەسئەلەکە کـە سـێ یـە ٥×٣=١٥ ئەگـەر مەسـئەلەکە بـەرز نەبوویـەوە ، یـان بـەوەی گەیشتووە مەسـئەلەکە بە بەرزبونـەوە ئەگـەر بەرز بوویـەوە ، ئـەوە پێك دێ ئەوەی داواکراوە .

وە مەسئەلەی مێرد و سێ خوشکی باوکی و دایکی :

| مێرد | ٣خوشکی باوك ودایك | مسئلە |
|---|---|---|
| ١/٢ | ٢/٣ | ٦ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣×٣ | ٣×٤ | ٢١=٣×٧ |
| ٩ | ١٢ | |

ئەصڵی مەسئەلەکە لە شەش وە بەرزدەکرێتەوە بۆ حەوت : بۆ مێـرد و سـێ لـە دابـەش دەکـرێ بـە سـەریا ، وە چـوار بـۆ خوشـکەکان (تبـاین) ی ژمارەکان ، ژمارەکەیان کە سێ یە کـەرەتی بکـە لـە ئەصـڵی مەسـئەلەکە بە بەرزکراوەیی کە حەوتـە راسـت دەبێتـەوە مەسـئەلەکە ٣×٧=٢١ لـە بیـست و یەك ، نۆ بۆ مێرد ، وە بۆ هەموو یەکێ لە خوشکەکان چوار تیرە .

وە ئەگــەر تیرەکــان (موافــق) ی ژمــارەی ســەری ئــەو کۆمەڵــە بــوو بیگەرێنەرەوە ئەو کۆمەڵە (موافق) ە بۆ موافەقەکەی کەرەتی بکە لە ئەصـڵی

مەسئەلەکە ، ئەگەر کەرەت لە سەر کۆمەڵێکیان بوو ، وە پەیدا دەبێت داواکراو ، وەك : دایك و شەش مام :

| مسئله | ٦مام | دایك |
|---|---|---|
| ٣×٣ | ماوە | ١/٣ |
| ٩ | | |
| | ٣×٢ | ٣×١ |
| | ٦ | ٣ |

ئەصڵی مەسئەلەکە سێ یە ، بۆ دایك تیرێ دابەش دەکرێ بە سەریا ، وە دوو تیر بۆ شەش مام دابەش ناکرێ بە سەریانا وە تیرەکان موافەقەی ژماری سەری مامەکان دەکا بە نیوە کە سێ یە ، وە سێ کە کەرەتی دەکەین لە ئەصڵی مەسئەلەکە دەکاتە نۆ ٣×٣ = ٩ وە مەسئەلەکە راست دەبێتەوە : سێ تیر بۆ دایك ، وە شەش تیر بۆ مامەکان یەکی یەك تیریان دەکەوێت .

وە لە مەسئەلەی مێرد و ٢٠خوشکی باوك و دایکی :

| مسئله | ٢٠خوشکی باوك و دایکی | مێرد |
|---|---|---|
| ٦ بەرزدەبێتەوە بۆ | ٢/٣ | ١/٢ |
| ٣٥=٥×٧ | ٥×٤ | ٥×٣ |
| | ٢٠ | ١٥ |

ئەصڵی مەسئەلەکە لە شەش وە بەرزدەبێتەوە بۆ حەوت : سێ تیرە بۆ مێرد وە سێ تیر بۆ ٢٠ خوشکەکە کە دابەش ناکرێ بە سەریاندا ، کەرتی تێ دەکەوێ .

وە تیرەکان موافەقەی هەیە لە گەڵ ژمارەی خوشکەکان بە چوار یەك کە پێنجە ، وە پێنجەکە کەرەتی ئەصڵی مەسئەلەکە دەکەین بە بەرزکراوەیی ٧×٥=٣٥ سێ وپێنج دەکات : بۆ مێرد پانزە تیرە ، وە بۆ خوشکەکان بیست تیرە کە هەر یەکی تیرێکیان دەکەوێ .

وه فەرمووده‌ى ( أو فأكثر) له پاش ئه‌مه‌وه حوكمه‌كه‌ى دێت .

**وإن تـر الكســـر على أجنـاس          فإنهـــا في الحكم عند الناس**

ئه‌گه‌ر كه‌رتت بينى له سه‌ر دوو كۆمه‌ڵ يا زياتر – به‌راستى ئه‌و چوار نيسبه‌ته له حوكمدا له لاى خه‌ڵكه .

**تحصـــر في أربعة أقســـام          يعرفهـا الماهـر في الأحكــام**

كورت هه‌ڵهێنراوه له چوار به‌شدا – ده‌يزانێ ئه‌و كه‌سه‌ى رۆيشتووه‌ته خوار له حوكمه‌كاندا .

**مماثـــل من بعـــده منـــاسب          وبعـــده موافـــق مصـــاحـــب**

ژماره‌ى مومائيل له دوايه‌وه ژماره‌ى موناسيبه – وه له دوايه‌وه ژماره‌ى موافق هاوڕێ يه بۆ ژماره‌يه‌كى تر .

**وبعـــده المبـــايـــن المخالـــف          ينبيك عن تفصيلهن العارف**

وه دواى موافق ژماره‌ى موباينه بۆ ژماره‌يه كه پێچه‌وانه‌يه بۆى – شاره‌زا ئاگادارت ده‌كاته‌وه له درێژه‌كه‌ى .

ئه‌گه‌ر كه‌رت رووى دا زياتر له كۆمه‌ڵێك ، به‌م شێوه‌ى كه‌رت له سه‌ر دوو كۆمه‌ڵه يا زياتر رووى دا له به‌شيانا ئه‌وه‌يه فه‌رمووده‌ى ( وان تـر الكسر علـى اجناس ) سه‌ير بكه ئه‌و كۆمه‌ڵه‌ى (تباين) ى تيره‌كه‌ى بوو ده‌رخيكه به ته‌واوى .

وه ئه‌و كۆمه‌ڵه‌ى (موافق) ى تيره‌كه‌يه‌تى بيگه‌ڕێنه‌وه بۆ مافه‌قه‌كه‌ى ، وه ده‌رخيكه موافقه‌كه‌ى ، له پاشا سه‌يرى ئه‌و دوو كۆمه‌ڵه كه ده‌رخكرا ، حاڵى ئه‌و دوو كۆمه‌ڵه له چوار به‌ش تێناپه‌ڕێ : يا هه‌ردوو كيان مماثل ه ، وه ئه‌و دوانه يه‌كسانن وه‌ك پێنج و پێنج ، وه هه‌ردووكيان مناسب و ده‌بێ كه‌مترينى پارچه‌ى ئه‌و دوانه له زۆره‌كه‌يان واته نيسبه‌ت ده‌درێ به زۆرتر له پارچه وه‌ك : نيوه‌ى و سێ يه‌كى و ده‌يه‌كى و نيوه‌ى هه‌شت يه‌ك ، ئه‌مه ليكدانه‌وه‌ى عوله‌ما عيراقييه پێشينه‌كانه .

وه متەئەخیرەکان لەیەکیان داوەتەوە بە (متداخلین) یا ئەو دوو کۆمەڵە (توافق) یان هەیە ، ئەو دەبێ لە نێوانیاندا موافەقە ببێ بەپارچەیە لە پارچەکان ، وەك چوار شەش ئەم دوانە موافەقەیان هەیە بە نیو ، یا ئەو دوانە (مباین)ی یەکن ئەوە نابێ لە نێوانیانا موفەقە لە پارچەیەکیدا ، وەك : پێنج و هەشت کە لە پێنج پارچەیەکیانا موافەقەیان نییە .

کاتێ ئەمەت زانی دەبێ کەرت لە سەر دوو کۆمەڵ دەبێ و بەس ، وەکەم جارێ کەرت لە سەر سێ کۆمەڵ دەبێ : وەکەم جارێکیش کەرت دەبێ لە سەر چوار کۆمەڵ وە لەمە تێناپەرێ ، وە بۆ حەرحاڵێك حوکمێك هەیە .

وە دانەر کورتی هەڵهێنراوە لە سەر روون کردنەوەی ئەوەی کە کەرت لە سەر دوو کۆمەڵ روو بدا و بەس .

**فخـــذ مــن المماثلين واحدا　　　　　وخـــذ من المناسبيـــن الزائدا**

وەری بگـرە لـە دوو مماپـل یـەکێك – وەری بگـرە لـە دوو مناسـب زیادەکەی .

**واضرب جميع الوفق في الموافق　　　　　واسلـك بذاك أنهـج الطرائق**

کەرەتی وەفقی یەکێکیان بکە لە تەواوی ئەوی تر – بەوە روون ترین رێگا بگرە بەر .

**وخـذ جميـع العـدد المباين　　　　　واضـربه في الثـاني ولا تداهن**

وەری بگرە هەموو ئەو ژمارەی (مباین)ە – وە کەرەتی بکە لە ژمارەی دووەم وە غەش مەکە .

**فذاك جـزء السهـم فاعْلَمَنْهُ　　　　　واحـذر هديت أن تَضِلَ عنه**

ئەوەی پەیدا بوو لە چوار نیسبەت بەشی تیرێکە بیزانە – خۆت بپارێزە رێنمایی کراوی کە گومرا ببی لێی .

واضربه في الأصل الذي تأصلا     واحص ما انضم وما تحصلا

وه بەشی تیرەکە کەرەت بکە لە ئەصلّی مەسئەلەکە دوویات کراوە – ڕێك و پێکی بکە ئەوەی ئەنجامە و پەیدا بووە لە کەرەتەکە .

واقسمه فالقسم إذا صحيح     يعرفه الأعجم والفصيح

وە دابەشی بکە لە سەر ژمارەکەیان دابەشەکە ڕاستە – دەیزانیّ عەجەب و زمان پاراو .

ئەگەر لە مەسئەلەکەدا کەرت لە سەر دوو کۆمەلّ بوو بەس ، وە دەرخت کرد ژمارەی ئەو کۆمەڵەی کە (تباین ) ی تیرەکەیەتی ، وە دەرخت کرد وەفقی ئەو کۆمەڵەی کە (موافق) ی تیرەکەیەتی ، سەیر بکە لەو دوو دەرخ کراوە کە جێگیر بووە ئەگەر هەردووکیان (متماثل ) بوون یەکێکیان وەرگرە وەك ئەم مەسئەلە : پیاوێك مردووە : دایك و پێنج برای دایك و پێنج مامی هەیە :

| دایك | ٥برای دایك | ٥ مام | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوه | ٥×٦ |
| | | | ٣٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٥ | ١٠ | ١٥ | |

ئەم مەسئەلە کەرت لە سەر دوو کۆمەڵە برای دایکی و مامەکان ئەصلّی مەسئەلەکە لە شەشە :

بەشی دایك شەش یەکە و یەك تیرە دەکات .

وە بەشی براکان سیّ یەکە کە دوو تیرە وە دابەش ناکریّ لە سەریاندا . وە بەشی مامەکان ماوەیە کە سیّ تیرە دووبارە دابەش ناکرێت بە سەریاندا بە بیّ کەرت ، لە پاشا سەیر دەکەین لە نێوان بەشی براکان و ژمارەی سەرەکانیان (تباین) هەیە ، وەری دەگرین ژمارەی سەری مامەکان کە پێنجە و دەرخی دەکەین لە پاشا سەیر دەکەین لە نێوان ژمارەی سەری

مامەكان و بەشەكانیان وە لە نێوانیاندا (تباین) هەیە ژمارەی سەری مامەكان دەرخ دەكەین ، لە پاشا سەیر دەكەین كە روون و ئاشكرایە (تماثل) هەیە لە نێوان ژمارەی سەرەكانا ژمارەی سەری براكان پێنجە و ژمارەی مامەكان پێنجە ، یەكێكیان لەو دوو پێنجە وەردەگرین وە پێنجەكە كەرەت دەكەین لە ئەصڵی مەسئەلەكە (٦) ٦×٥=٣٠ كە راست بوونەوەی مەسئەلەكەیە .

وە ئەگەر هەردووكیان (متناسب ) بوون كامیان زیاد بێ وەری بگرە وەك ئەم مەسئەلە : ژنێك مردووە : دایك و چوار برای دایكی و چوار مامی هەیە :

| مسئله | ٤مام | ٤برای دایی | دایك |
|---|---|---|---|
| ٦×٤ | ماوە | ١/٣ | ١/٦ |
| ٢٤ | | | |
| | ٣ | ٢ | ١ |
| | ١٢ | ٨ | ٤ |

بەشی دایك لەم مەسئەلەدا شەش یەكە كە یەك تیر دەكات ، وە بەشی براكان سێ یەكە كە دوو تیرە دابەش ناكرێ بە سەریاندا بەڵام لە نێوان و تیرەكان و ژمارەی سەرەكان (توافق) هەیە بە نیو وەری دەگرین وەفقی سەرەكان (٢) وە دەرخی دەكەین .

وەبەشی مامەكان ماوەیە كە سێ تیرە دابەش ناكرێت بە سەر مامەكاندا وە لە نێوانیانا (تباین) هەیە دەرخی دەكەین ژمارەی سەری مامەكان كە چوارە و وەفقی سەری براكان كە (٢) دەستمان دەكەوێت لە نێوانیانا كە (تداخل) ژمارەی (٢) لە ناو ژمارە (٤) دایە ، وەری دەگرین گەورەترین ژمارەیان كە (٤) ، وە كەرەتی دەكەین لە ئەصڵی مەسئەلەكە كە شەشە ، نەتیجەكەی دەبێ بە (٤×٦=٢٤ ) ئەوەیە راست كردنەوەی مەسئەلەكەیە .

وە ئەگەر هەردووکیان (متوافق) بوون کەڕەتی وەفقی یەکێکیان بکە لە هەمووی ئەوی تردا وەك ئەم نمونە :

پیاوێك مردووە : دایك ١٥ برای دایکی و ١٠ مامی هەیە :

| دایك | ١٥برای دایکی | ١٠ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٣٠×٦ |
| | | | ١٨٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٣٠ | ٦٠ | ٩٠ | |

ئەصڵی مەسئەلەکە شەشە :

بەشی دایك یەك تیرە .

وە بەشی براکان دوو تیرە کە دابەش ناکرێ بە سەریاندا بە بێ کەرت ،
وە لە نێوان ژمارەی سەری براکان و تیرەکان (تباین) هەیە ژمارەی سەری براکان دەرخ دەکەین کە (١٥) یە .

وە بەشی مامەکان ماوەیە کە سێ تیرە دابەش ناکرێت بە سەریاندا بە بێ کەرت .

وە لە نێوان ژمارەی سەرەکان و تیرەکان (تباین) هەیە ژمارەی سەرەکان کە (١٥) یە دەرخی دەکەین لە پاشا سەیری نێوان ژمارەی براکان کە ١٥ یە و نێوان ژمارەی مامەکان کە ١٠ یە دەستمان کەوت توافق لە نێوانیاندا لە (پێنج ) دایە .

وەری دەگرین وەفقی سەری یەکێکیان کەرەتی دەکەین لە تەواوی ژمارەی سەرەکانی تر وە ئەوەی پەیدا دەبێت واتە ئەصڵی مەسئەلەکە کەڕەت دەکەین کە (٦) ە بەوەی پەیدا بووە بە کەڕەتەکە (٢×١٥=٣٠) دەگاتە (١٨٠) .

وە ئەگەر هەردووکیان (متباین) بوون یەکێکیان کەڕەت بکە لەوی تریاندا بە تەواوی وەك ئەم نمونە :

پیاوێك مردووه : دایك و ٣برای دایكی و ٢مامی هەیە :

| دایك | ٣برای دایكی | ٢ مام | مسئلە ٢×٣=٦ |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٦×٦ |
| | | | ٣٦ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٦ | ١٢ | ١٨ | |

بەشی دایك یەك تیرە .

وە بەشی براكان دوو تیرە كە دابەش ناكرێت بە سەریاندا لە نێوان ژمارەی سەرەكان و تیرەكان (تباین) هەیە ژمارەی سەری براكان كە (٣) یە دەرخی دەكەین .

وە بەشی مامەكان سێ تیرە كە دابەش ناكرێت بە سەریاندا بە بێ كەرت وە (تباین) لە نێوان ژمارەی سەرەكان و تیرەكاندا هەیە ژمارەی سەرەكان كە (٢) ە دەرخی دەكەین لە پاشا سەیر دەكەین لە نێوان سەرەكان ( ٢، ٣ ) (تباین) هەیە بە تەواوی هەندێكیان كەرەت دەكەین لەوی تریان (٢×٣=٦ ) وە پەیدا بوو كەرەتەكە كە (٦) ە دەبێت بە پارچەی تیری كەرەتی ئەصڵی مەسئەلەكە (٦×٦=٣٦) ئەوە راست كردنەوەی مەسئەلەكەیە .

لە پاشا پارچەی تیرەكە كەرەت دەكەین لە بەشی هەموو كۆمەڵێك لە میرات بەر وە ئەوەی پەیدا بوو لە كەرتی تیرەكانی هەموو كۆمەڵێ دابەش دەكرێ بە سەر ژمارەی سەرەكاندا .

ئەوەی پەیدا بوو لە هەموو حاڵێكدا لەو چوار حاڵەتە ئەوە پارچەی تیری مەسئەلەكەیە ، كەرەتی بكە لە ئەصڵی مەسئەلەكە ئەگەر زیادی تێدا نەكرابوو ، وە بە زیادەكە وە ئەگەر زیادكرا بوو پەیدا دەبێت راست كردنەوەی مەسئەلەكە ئەو ژمارەیە راست دەكرێتەوە لێی دابەش كردنی مەسئەلەكەیە ، دابەشی بكە بە سەر میراتبەران ، ئەو نمونانەی دەرخ كراوە

لە (تماثل)وەك : دایك و پێنج برای دایكی و پێنج مام یان ١٥ مامە :

| دایك | ٥برای دایك | ٥ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٥×٦ |
| | | | ٣٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٥ | ١٠ | ١٥ | |

ژمارەی سەری براكان و مامەكان (تماثل) یان هەیە یەكێكیان وەربگرە وە كەرەتی ئەصڵی مەسئەلەكەی بكە (٦×٥=٣٠) مەسئەلەكە پەیدا دەبێت و راست دەبێتەوە :

| دایك | ٥برای دایك | ١٥ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٥×٦ |
| | | | ٣٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٥ | ١٠ | ١٥ | |

وەك دایك و ١٠برای دایكی و ١٥ مامە :

| دایك | ١٠برای دایك | ١٥ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٥×٦ |
| | | | ٣٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٥ | ١٠ | ١٥ | |

پارچـەی تـیری ئـەو سـێ مەسـئەلە (٥) ە راسـت دەبێتـەوە لـە (٣٠)

نمونەی (تناسب) وەك : دایك و چوار برای دایكی و چوار مام یان ١٢ مام :

| دایك | ٤برای دایك | ٤ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٤×٦ |
| | | | ٢٤ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٤ | ٨ | ١٢ | |

| دایك | ٤برای دایك | ١٢مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٤×٦ |
| | | | ٢٤ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٤ | ٨ | ١٢ | |

پارچەی تیری ئەو مەسئەلە لە چوارە ، وە راست دەبێتەوە لە (٢٤) وە نمونەی (توافق) وەك : داك و ١٥ برای دایکی و ١٠ مام یان ٣٠ مام :

| دایك | ١٥برای دایك | ١٠ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوه | ٣٠×٦ |
| | | | ١٨٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٣٠ | ٦٠ | ٩٠ | |

| دایك | ١٥برای دایك | ٣٠ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوه | ٣٠×٦ |
| | | | ١٨٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٣٠ | ٦٠ | ٩٠ | |

لە پێشەوە بە درێژایی باس کراوە

وەك دایك و ٣٠برای دایکی و ١٠ مام یان ٣٠مام :

| دایك | ٣٠برای دایك | ١٠ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوه | ٣٠×٦ |
| | | | ١٨٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٣٠ | ٦٠ | ٩٠ | |

(توافق) لەم سێ مەسئەلە (٥) پارچەی تیر لە هەموو ئەم وێنانەدا (٣٠) ە وە راست دەبێتەوە (١٨٠) .

وە نمونەی (تباین) وەك دایك و ٣یرای دایکی و ٢مام یان ٦مام :

| دایك | ٣برای دایك | ٢ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوه | ٦×٦ |
| | | | ٣٦ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٦ | ١٢ | ١٨ | |

| دایك | ٣برای دایك | ٢ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوه | ٦×٦ |
| | | | ٣٦ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٦ | ١٢ | ١٨ | |

پارچەی تیر لەم دوو نمونەیەدا شەشە وە راست دەبێتەوە مەسئەلەکە لە (٣٦) دابەشی بکە لە هەموو وێنەیەکدا ئەوەی راست بووەتەوە لێی مەسئەلە لە سەر میراتبەر بەم شیوە کەرەتی بکە پارچەی تیری مەسئەلەکە

، له بەشی هەموو كۆمەڵیٚ له ئەصڵی مەسئەلەكە وە دابەش دەكریٚ ئەوەی پەیدا بووە لە سەر ژمارەی سەری ئەو كۆمەڵە ، پەیدا دەبیٚ بەشی هەموو سەریٚ لەو كۆمەڵ لە كۆمەڵی راست كردنەوەكە ئەگەر روویدا كەرت لە سەر سیٚ كۆمەڵ یا لە سەر چوار كۆمەڵ سەیر بكە لە نێوان هەموو كۆمەڵێك و تیرەكانی دەرخیكە ژمارەی سەری كۆمەڵی (مباین) و وەفقی سەری كۆمەڵی (موافق) ەكەی لە پاشا سەیری دەرخكراوەكان بكە ئەگەر هەموو (متماثل) ە یەكێكیان پارچەی تیرە .

وە ئەگەر هەموو (متداخل ) بوون زۆرترینیان پارچەی تیرەكەیە وە ئەگەر هەمووی (متباین)ە كەڕەتی بكە هەندێكی لەوی تریان .

ئەوەی پەیدا دەبیٚ پارچەی تیرەكەیە وە ئەگەر هەموو (متوافق) ە یان جیاز بوون سەیر بكە لەو دوو دەرخكراوە لێیان وەری بگرە یەكێكیان ئەگەر (تماثل) بوون وە گەورەكەیان ئەگەر (تناسب) بوون وە ئەوەی پەیدا دەبێت كەرەتی یەكێكیان لە وەفقی ئەوی تر ئەگەر (توافق)یان بوو وە لە هەمووی ئەگەر (تباین) یان بوو .

لە پاشا سەیر بكە لە نێوان ئەوەی وەرت گرتووە وە لە نێوان دەرخكراوی سێهەم وە وەری بگرە یەكێكیان یان گەورەكەیان ، ئەوەی پەیدا دەبێت لە كەرەت كردنی یەكێكیان لە وەفقی ئەوەی تر یا هەمووی لە سەر ئەوەی رابوورد ، وەرگیراوی دووەم ئەوە پارچە تیری مەسئەلەكەیە ئەگەر دەرخكراوەكان سیان بوون ئەگەر كەڕت لە چوار كۆمەڵدا بوو سەیر بكە لە نێوان ئەوەی وەرت گردتووە دووەم جار .

وە لە نێوان دەرخكراوی چوارەم ، وە وەری بگرە یەكێكیان یان گەورەكەیان یان كەڕەتكراوی یەكێكیان لە وەفقی ئەوەی تر یان لە هەموو ئەوە پارچەی تیری مەسئەلەكەیە ، كەڕەتی بكە لە هەمووی وەك پێشكەوت پەیدا دەبێت راست كردنەوەی مەسئەلەكە .

ئەگەر بە جێما پێنج نەنك و پێنج برای دایكی و پێج مام :

| ٥نەنك | ٥برای دایك | ٥ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٥×٦ |
| ٦ | ٣ | | ٣٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٥ | ١٠ | ١٥ | |

پارچەی تیرەكەیان (٥) لە بەر ئەوەی سەرەكان (متماثل) ن وە راست دەبێتەوە لە (٣٠) یان ئەگەر بە جێما : ٥برای دایكی و ١٠ نەنك و ٢٠ مام :

| ٥برای | ١٠ نەنك | ٢٠ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٣ | ١/٦ | ماوە | ٢٠×٦ |
| ٣ | ٦ | | ١٢٠ |
| ٢ | ١ | ٣ | |
| ٤٠ | ٢٠ | ٦٠ | |

پارچەی تیری مەسئەلەكە (٢٠) ە لە بەر ئەوەی لە نێوان سەرەكان (تداخل) هەیە وە راست دەبێتەوەلە (١٢٠) .

وە ئەگەر بە جێما : ١٠ نەنك و ١٥ برای دایكی و ٢٥ مام :

| ١٠ نەنك | ١٥برای دایك | ٢٥ مام | مسئلە ١٠×١٥=١٥٠ |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ١٥٠×٦ |
| ٦ | ٣ | | ٩٠٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ١٥٠ | ٣٠٠ | ٤٥٠ | |

پارچەی تیرەكەی (١٥٠) یە لە بەر (توافق) لە نێوان سەرەكان بە پێنج وە راست دەبێتەوە لە (٩٠٠) .

وە ئەگەر بە جێما دوو نەنك و ٣برای دایکی و ٥ مام ، یان دوو نـەنك و ٦برای دایکی و ١٥ مام :

| ٢نەنك | ٣برای دایك | ٥ مام | مسئلە ٣٠=٥×٣×٢ |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٣٠×٦ |
| | | | ١٨٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٣٠ | ٦٠ | ٩٠ | |

| ٢نەنك | ٦برای دایك | ١٥ مام | مسئلە ٢×١٥=٣٠ |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماود | ٣٠×٦ |
| | | | ١٨٠ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٣٠ | ٦٠ | ٩٠ | |

پارچەی تیر لە هەموو یەکێك لـەو دوو وێنـەدا (٣٠)ە لـە بـەر (تبـاین) ی دەرخکراوەکان وە راست دەبێتەوە لە (١٨٠) .

وە ئەگەر بە جێما ٤ ژن و ٨ نەنك و ١٦ برای دایکی و ٤ مام :

| ٤ژن | ٨نەنك | ١٦برای دایك | ٤ مام | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٤×١٢ |
| | | | | ٤٨ |
| ٣ | ٢ | ٤ | ٣ | |
| ١٢ | ٨ | ١٦ | ١٢ | |

ئەصلی مەسئەلەکە لە (١٢) یە کەرت لە بەشی چوار کۆمـەڵ روو دەدات وە پارچـەی تیرەکـەی (٤) ە لـە بـەر (تماپـل) لـە نێوانیانـدا ، وە راسـت دەبێتەوە لە (٤٨) .

وە ئەگەر بە جێما دوو ژن و ٦نەنك و ١٠ برای دایکی و ٧ مام :

| ٢ژن | ٦نەنك | ١٠برای دایك | ٧ مام | مسئلە ٢١٠=٧×١٠×٣ |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٢١٠×١٢ |
| | | | | ٢٥٢٠ |
| ٣ | ٢ | ٤ | ٣ | |
| ٦٣٠ | ٤٢٠ | ٨٤٠ | ٦٣٠ | |

پارچەی تـیری مەسئەلەکە (٢١٠)یە لە بەر بوونی (تباین) لـە سـەری کۆمەڵەکانا وە راست بوویەوە مەسئەلەکە لە (٢٥٢٠) .

وە ئەگەر بە جێما : ٤ژن و ٥ نەنك و ٧ كچ و باپیرێ :

| ٤ژن | ٥نەنك | ٧كچ | باپیر | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ١/٦ | ٢/٣ | ١/٦ + ماوە | ٢٤ بەرزبوویەوە بۆ |
| ٣ | ٤ | ١٦ | ٤ | ٣٧٨٠=١٤٠×٢٧ |
| ٤٢٠ | ٥٦٠ | ٢٢٤٠ | ٥٦٠ | |

ئەصڵی مەسئەلەكە لە (٢٤) ە بەرزبوویەوە بۆ (٢٧) وە پارچەی تیری مەسئەلەكە (١٤٠) ە راست دەكرێتەوە لە (٣٧٨٠) .

**فهذه من الحساب جمل يأتي على مثالهن العمل**

ئەمە لە ژمارە كۆمەڵێكە - دێت لە سەر نمونەیان كار كردن .

**من غير تطويل ولا اعتساف فاقنع بما بين فهو كافي**

بە بێ درێژەدان و لادان وەرگرتن لە سەر غەیری رێگای راست - قەناعەت بكە بەوەی روونكراوە ئەوە بەسە .

وە چەند مەسئەلەیەكمان وەرگرت لە كتێبی (الفتح الوامض) بۆ زیادە شارەزایی :

مەسەئەلەی (تماثل) وەك :

(أ) كەسێك مردووە : شەش خوشكی دایكی و نۆمامی باوكی و نەنكێكی هەیە :

| ٦خوشكی دایكی | نەنك | ٩ مام باوكی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٣ | ١/٦ | ماوە | ٣×٦ |
| | | | ١٨ |
| ٢ | ١ | ٣ | |
| ٦ | ٣ | ٩ | |

(ب) کەسێك مردووە : سێ کچ و سێ مامی هەیە :

| ٣کچ | ٣مام | مسئله |
|---|---|---|
| ٢/٣ | ماوه | ٣×٣ |
| | | ٩ |
| ٢ | ١ | |
| ٦ | ٣ | |

(جـ) پیاوێك مردووە : چوار ژن و شانزە خوشکی دایکی و مامێکی باوکی هەیە :

| ٤ژن | ١٦خوشکی دایکی | مام باوکی | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٣ | ماوه | ٤×١٢ |
| | | | ٤٨ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |
| ١٢ | ١٦ | ٢٠ | |

(د) پیاوێك مردووە : ژنێك و شەش خوشکی باوکی و شەش خوشکی دایکی هەیە :

| ژن | ٦خوشکی باوك | ٦خوشکی دایکی | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ٢/٣ | ١/٣ | ١٢ بەرزبوویەوە بۆ |
| ٣ | ٨ | ٤ | ٣×١٥ |
| ٩ | ٢٤ | ١٢ | ٤٥ |

(هـ) پیاوێك مردووە : ژنێك و سێ خوشکی باوکی و سێ خوشکی دایکی :

| ژن | ٣خوشکی باوك | ٣خوشکی دایکی | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ٢/٣ | ١/٣ | ١٢ بەرزبوویەوە بۆ |
| ٣ | ٨ | ٤ | ٣×١٥ |
| ٩ | ٢٤ | ١٢ | ٤٥ |

(و) پیاوێك مردووە : ژنێك و پێنج نەنك و دە خوشكی باوكی و دوو خوشكی دایكی هەیە :

| ژن | ٥نەنك | ١٠خوشكی باوك | ٢خوشكی دایكی | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ٢/٣ | ١/٣ | ١٢ بەرزبوویەوە بۆ |
| ٣ | ٢ | ٨ | ٤ | ٥×١٧ |
| ١٥ | ١٠ | ٤٠ | ٢٠ | ٨٥ |

(ز) پیاوێ: مردووە : نەنكێك و هەشت ئەولادی دایكی و هەژدە مامی باوكی :

| نەنك | ٨ئەولاد دایكی | ١٨مامی دایكی | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ١٢× ٦ |
| | | | ٧٢ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ١٢ | ٢٤ | ٣٦ | |

(ح) ژنێك مردووە : كچێك و چوار كچی كوڕ و شەش نەنك و مامێكی هەیە :

| كچ | ٤كچی كوڕ | ٦نەنك | مام | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٦ | ماوە | ١٢×٦ |
| | | | | ٧٢ |
| ٣ | ١ | ١ | ١ | |
| ٣٦ | ١٢ | ١٢ | ١٢ | |

(ط) ژنێ: مردووە ، مێرد و چوار كچ و ١٢ ئەولادی دایكی هەیە :

| مێرد | ٤كچ | ١٢ئەولادی دایكی | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٤ | ٢/٣ | بێ بەش بە كچەكان | ٤×١٢ |
| | | | ٤٨ |
| ٣ | ٨ +١ | دەگەڕێتەوە بۆ كچەكان | |
| ١٢ | ٣٦=٤×٩ | | |

(ى) پياوێك مردووه دوانزه خوشكى دايكى و نۆ مامى هەيه :

| ١٢خوشكى باوك | ٩مام | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٣ | ماوه | ١٢ × ٩ |
| | | ٢٧ |
| ١ | ٢ | |
| ٩ | ١٨ | |

(ك) پياوێك مردووه شەش نەنك و سێ براى دايكى و برايەكى باوكى هەيه :

| ٦نەنك | ٣براى دايكى | براى باوكى | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوه | ٦×٦ |
| | | | ٣٦ |
| ١ | ٢ | ٣ | |
| ٦ | ١٢ | ١٨ | |

(ل) پياوێك مردووه : شەش نەنك و شەش خوشكى باوكى و مامێكى باوكى هەيه :

| ٦نەنك | ٦خوشكى باوك | مامى باوكى | مسئله |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ٢/٣ | ماوه | ٦×٦ |
| | | | ٣٦ |
| ١ | ٤ | ١ | |
| ٦ | ٢٤ | ٦ | |

(م) پياوێك مردووه ژنێك شەش نەنك و هەشت ئەولادى دايكى و كورى برايەكى هەيه :

| ژن | ٦نەنك | ٨ئەولادى دايكى | كوڕى برا | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٤ | ١/٦ | ١/٣ | ماوه | ١٢ × ٦ |
| | | | | ٧٢ |
| ٣ | ٢ | ٤ | ٣ | |
| ١٨ | ١٢ | ٢٤ | ١٨ | |

## باب المناسخات

### مردنی هەندیٚ لە میراتبەرەکان بەر لە دابەش کردنی میراتەکە

ئەمە بابێکە باس لە جۆرێك لە راستکرنەوەی مەسائیلەکان دەکات ، بەلاّم ئەوەی لە پێشەوە راست کردنەوەی مەسەلە بوو بە نیسبەت یەك مردوەوە ، وە ئەمە راستکرنەوەی مەسئەلەیە بە نیسبەت دوو مردووە وە یا زیتر ، بۆیە دانەریش لە پاش حیسابەوە باسی کرد .

(مناسخە) لە زاراوەی زاناکان ئەوەیە : کەسیٚ بمریٚ و میراتەکەی دابەش نەکریٚ تا یەکێك یا زیاتر لە میراتبەران بمریٚ ، ناوبراوە بە (مناسخە) لە بەر ئەوەی مەسەلەی یەکەم هەڵواشاوەتەوە بە مەسەلەی دووەم ، یا لە بەر ئەوەی ماڵەکە دەگۆزرێتەوە تیایا لە میرات بەریٚ بۆ میرات بەرێکی تر .

وە لە زمانی عەرەبیدا (نسخ) بە واتای لاچوونە یان گواستنەوەیە ، لەوانەیە : (نسخت الكتاب) گواستمەوە ئەو کتێبەیە کاتیٚ دەبیٚ گواستبێتەوە ئەوەی تیایا بوبیٚ .

**وان يمت آخر قبل القسمة    فصحح الحساب واعرف سهمه**

ئەگەر مرد لە میراتبەری مردووی یەکەم یەکێکی تر پێش دابەش کردنی میرات – راستی کەرەوە حیساب بۆ مەسەلەی یەکەم وە بزانە تیری مردووی دووەم .

**واجعل له مسألة أخرى كما    قد بين التفصيل فيما قدما**

بیگەرێنە بۆ مردووی دووەم مەسەلەیەکی تر وەك – بەراستی ئەوەی روونکرایەوە بە درێژی لەوەی رابوورد .

**وان تكن ليست عليها تنقسم    فارجع إلى الوفق بهذا قد حكم**

ئەگەر بەشی مردووی دووەم لە مەسەلەی یەکەم دابەش نەدەکرا بە سەر مەسەلەی دووەم – بگەرێرەوە بۆ وەفق ، بەو گەرانەوە بەراستی حوکم کراوە پێی .

**وانظر فإن وافقت السـهاما فخـذ هديت وفقهـا تمـامـا**

سەیر بکە : ئەگەر موافەقەی کرد تیرەکان بۆ مەسەلەکە – وەری بگرە وەفقی مەسەلەکە ڕێنمایی کراوی .

**واضربه به أو جميعها في السابقة إن لـم تكن بينهمـا موافقة**

کەڕەتی بکە وەفقەکە یا هەمووی مەسەلەی دووەم لە یەکەم – ئەگەر نەبوو لە نێوان موافەقە واتە : ئەگەر لە نێوانیانا جیاوازی یان نا هەمواری هەبوو .

**وكل سهم في جميع الثانيـة يضـــرب أو في وفقها علانيـة**

هەموو تێرێ لە مەسەلەی دووەم – کەڕەت دەکرێ یا لە وەفقەکەی بە ئاشکرا

**وأسهم الأخرى ففي السهـام تضرب أو فـي وفقهـا تمـــام**

تیرەکانی تر لە تیرەکان – کەڕەت دەکرێ یا لە وەفقی تەواوە

**فهذه طريقة المناســخـة فــارق بها رتبــة فضل شـامخة**

ئەکە ڕێگـای موناسـەخەیە – سـەرکەوە بـەو ڕێگایـە جێگـای بـەرزی ڕێزدار .

ئەگەر کەسێك مرد لە پاشا یەکێکی تر مرد لە میرات بەری مردووی یەکەم پێش دابەش کردنی میراتەکەی ، ڕاستی کەردوە مەسەلەی مردووی یەکەم .

وە بزانـە بەشـی مـردووی دووەم لـە مەسـەلەی یەکەمـدا ، وە مەسەلەیەکی تری بۆ دروست بکە : بەم شێوەیە مەسەلەی مردووی یەکەم ڕاست بکەرەوە و دابەشی بکە وەك ڕابوورد لە پاشا دابەشی بکە بەشی مردووی دووەم لە مەسەلەی یەکەم بە سەر مەسەلەی خۆیدا کە مەسەلەی دووەمە ئەگەر دابەش کرا بە بێ کەڕەت ئەوە ڕوون و ئاشکرایە ، لە بەر ئەوەی پێویستی نییە بە کار کردن .

نمونە : ژنێك مردووە : مێرد و دایك و مامی هەیە :

| مێرد | دایك | مامی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ماوە | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | |

لە پاشا مێردەکە مرد ، لە سێ کوڕ یا باوك و دایکی :

| ٣کوڕ | مسئلە |
|---|---|
| ٣ | ٣ |

| دایك | باوك | مسئلە |
|---|---|---|
| ١/٣ | ماوە | ٣ |
| ١ | ٢ | |

مەسەلەی مردووی یەکەم :ڕاست دەبێتەوە لە ئەصڵی مەسئەلەکەدا کە شەش : بۆ مێرد سێ ، بۆ دایك دوو ، بۆ مام یەك ، وە مەسەلەی دووەم کە مێردە لە هەردوو مەسەلەکەدا ڕاست دەبێتەوە لە سێ ، وە بەشی مێرد لە مەسەلەی یەکەمدا سێ یە ، دابەش دەکرێ بە سەر مەسەلەکەدا ، ڕاست دەکرێتەوە هەموو موناسەخەکە لە شەش ، وە ئەوە مەبەست بووە بە فەرموودەی ( کما قد بیّن التفصیل فیما قدّما )) .

وە ئەگەر بەشی مەسەلەی دووەم دابەش نەدەکرا بە سەر مەسەلەکەدا بگەڕێرەوە بۆ وەفقی ، بەم شێوەیە : سەیرکە ئایا لە نێوان تیری دووەم و مەسەلەکەدا موافەقە یا موباینە هەیە ، ئەگەر موافەقەی بوو تیرەکەی بۆ مەسەلەکەی وەریگرە وەفقی مەسەلەکە و کەڕەتی بکە لێی لە مەسەلە پێشووەکە ، ئەوە مەسەلەی مردووی یەکەمە ، نمونەکەی و مەسەلەی یەکەم بە حاڵی خۆی : مێردەکە لە مسئلەی یەکەمدا مرد لە شەش کوڕ ، یا دایك و دوو برای دایکی و برایەکی باوکی:

| ٦کوڕ | مسئلە |
|---|---|
| ٦ | ٦ |

| دایك | ٢برای دایکی | برای باوکی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٦ | ١/٣ | ماوە | ٦ |
| ١ | ٢ | ٣ | |

مەسەلەكە لە هەردوو وێنەكەدا راست دەبێتەوە ئەصلی مەسەلەكە لە شەش ، وە تیری مێردەكە لە مەسئەلەی یەكەمدا سێ یە ، دابەش ناكرێ بە سەر مەسئەلەكەیدا بە بێ كەرت ، بەلام موافەقەی مەسئەلەكە هەیە بۆ سەری براكان بە سێ یەك كە دووە ، كەرەتی بكە سێ یەكی مەسئەلەكە دوو تیرە لە مەسئەلەی یەكەمدا ئەویش شەش راست دەبێتەوە موناسەخەكە لە دوانزە :

| مێرد | دایك | مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{3}$ | ماوە | ٢×٦ |
| | | | ١٢ |
| ٣ | ٢ | ١ | |
| ٦ | ٤ | ٢ | |

بۆ دایك لە مەسئەلەی یەكەمدا چوار ، وە بۆ مام دوو تیرە ، وە بۆ وەرەسەی مردووەكە شەش ، لە مەسئەلەی دووەمدا لە هەردوو وێنەكەدا ، مەسئەلەكە لە شەشە میراتْ بەرەكان بە بێ كەرت بەشی مێردەكە دابەش دەكرێ بە سەریاندا .

وە ئەگەر نەبوو لە نێوان بەشی مردووە دووەمدا و مەسئەلەكەیدا موافەقە . بەم شێوەیە ئەگەر (تباین) بوو ، مەسەلەی دووەم هەمووی كەرەت دەكەی لە مەسئەلەی یەكەم ، لە هەردوو حاڵەتدا پەیدا دەبێ راست كردنەوەی موناسەخە ، وەك ئەم نمونەیە :

ئەگەر مێردەكە مرد لە دە كوڕ یا لە كچێك و پێنج برای دایك و باوكی یا باوكی :

| ١٠كوڕ | مسئلە |
|---|---|
| ١٠ | ١٠ |

| كچ | ٥برا | مسئلە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | ماوە | ١٠ |
| ٥ | ٥ | |

راست دەبێتەوە مەسئەلەکە تیانا بە دە ، بۆ هەموو کوڕێ تیرێ ، وە بۆکچەکە پێنج ، وە بۆ هەموو برایەك تیرێك ، وە تیری مێرد لە مەسەلەی یەکەمدا سێ یە ، (تباین) ی دەیە ، کەڕەتی بکە دەکە لە هەموو مەسەلەی یەکەم ، راست دەبێتەوە موناسەخە لە شەست : ١٠×٦ = ٦٠

| مێرد | دایك | مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ماوە | ١٠×٦ |
| | | | ٦٠ |
| ٣ | ٢ | ١ | |
| ٣٠ | ٢٠ | ١٠ | |

بۆ مام لە مەسەلەی یەکەمدا دە ، وە بۆ دایك بیست ، وە بۆ میرات بەری مێرد سێ یە .

ئەگەر ویستت موناسەخەکە دابەش بکەی کەڕەتی بکە تیری هەموو میرات بەر لە مەسەلەی یەکەم لە هەموو مەسەلەی دووەم لە کاتی (تباین) دا بۆ تیری هاوڕێ کەی ، وە کەڕەتی بکە لە وەفقی مەسەلەی دووەمدا لە وافەقەکەیدا ، وە کەڕەتی بەکە تیری هەموو میرات بەر لە دووەم لە هەموو تیری میرات بەرێ لە کاتی (تباین) دا ، وە لە وەفقەکەی لە کاتی (توفق) دا .

وە لە وێنەی : مێرد و دایك و مامدا :

| مێرد | دایك | مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٣ | ماوە | ٦ |
| ٣ | ٢ | ١ | |

وە مێردەکە مرد لە شەش کوڕ راست دەبێتەوە لە دوانزە ، لە بەر موافەقەی مەسەلەی دووەم بۆ تیرەکەی بە سێ یەك کە دووە ، لە بەر ئەوەی بۆ دایکی مردووی یەکەم لە مەسەلەکەیدا دوو تیر لە وەفقی دووەم کە دوو تیرە بۆ دایکەکە هەیە چوار : وە بۆ مامەکەی تیرێ کەڕەتی دوو تیر دەدەی

پەیدا دەبێ بۆی دوو تیر ، وە بۆ هەموو یەکێك لە ئەولادی مێردەکە لە مەسەلەی دووەمدا تیرێ هەیە لە سێ یەکی میرات ئەویش تیرێکە بۆی پەیدا دەبێ .

وە لە وێنەی مێرد و دایك و مامدا ، مێردەکە مردووە لە کچێك و پێنج برا :

| کچ | ٥برا | مسئلە |
|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە هیچ نەمایەوە | ٥×٢<br>١٠ |
| ١ | ١ | |
| ٥ | ٥ | |

پێشکەوت کە ئەم مەسئەلیە راست دەبێتەوە لە شەست . لە بەر (مباین) ی تیری دووەم بۆ مەسەلەکە .

کەرەتی بکە بۆ دایکی مردووی یەکەم دوو تیرەکەی لە دە کە هەمووی مەسئەلەی دووەمە پەیدا دەبێ بۆی بیست (٢×١٠=٢٠) .

وە بۆ مام تیرێ کەرەتی بکە بۆی هەیە دە (١×١٠=١٠) وە کەرەتی بکە بۆ کچی مردووە دووەم پێنج لە مەسئەلەکەی خۆیدا لە تیرەکەی کە سێ یە بۆی هەیە پانزە (٥×٣=١٥) وە کەرەتی بکە بۆ هەموو یەکێ لە براکان تیرەکەی لە سێ بۆی هەیە سێ تیر ((١٠÷٥=٣) وە سێ بەشی هەموو یەکێکە لە براکان ، کەرەتی یەك بۆی هەیە سێ تیر (٣×١=٣) وە قیاس بکەرە سەری ئەمە .

دانەر کورتی هەڵهێناوە وە باسی نەکردووە جگە ئەوەی ئەگەر مرد دوو مردوو بەس ، لە بەر خاتری ئاسانی لە سەر ئەو کەسەی کە سەرەتایەتی لەم عیلمەدا ، وە باسی چۆنییەی دابەش کردنی میراتەکەی نەکردووە ، ئەویش ئەو بەرهەمە مەبەستەکەیە لە زاتی خۆیدا . وە ئێمە باسی دەکەین :

ئەمەش ئەگەر میرات لەو شتا نەبوو بژمێرریٚ بە یەکسانی لە رووی ئەندازە و نرخەوە ، وەك دیرهەم و دینار ئەوە چەند ریگایەکی تێدایە ، لەیرەدا سیٚ ریٚگا باس دەکەین :

ریٚگای یەکەم : ئەوەیە کەرەتی بکە تیری هەموو میراتبەریٚ لە مەسئەلەکە لە میراتەکە ، وە دابەش دەکریٚ ئەوەی پەیدا بوو لە سەر مەسئەلەکە ، پەیدا دەبێت بەش لە میراتەکە .

ئەگەر کەسیٚ مرد و لە پاشی بە جێما : دایك ، وژنێك و مامیٚ ، وە سەد دیناری لیٚ بە جێما :

| ژن | دایك | مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٤}$ | $\frac{١}{٣}$ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |

مەسئەلەکە لە دوانزەیە : بۆ ژنەکە سیٚ ، وە بۆ دایك چوار ، وە بۆ مام پێنج ، سیٚی ژنەکە کەرەت بکە لە سەد (٣×١٠٠=٣٠٠) وە دابەشی بکە ئەو سیٚ سەدە لە سەر مەسئەلەکە کە (١٢) یە ( ٣٠٠÷١٢=٢٥) بۆی دەردەچیٚ (٢٥) بیست و پێنج دینار .

وە چواری دایکەکە کەرەت بکە لە سەد (٤×١٠٠=٤٠٠) دابەشی بکە ئەو چوار سەدە لە سەر مەسئەلەکە کە (١٢) یە (٤٠٠÷١٢= $\frac{١}{٣}$ ٣٣) بۆی دەردەچیٚ سی و سیٚ و سیٚ یەکی دیناریٚ .

وە پێنجی مامەکە کەرەت بکە لە سەد (٥×١٠٠=٥٠٠) دابەشی بکە ئەو پێنج سەدە لە سەر مەسئەلەکە کە (١٢) یە (٥٠٠÷١٢= $\frac{٢}{٣}$ ٤١) بۆی دەردەچیٚ چل و یەك و دوو سیٚ یەکی دیناریٚ .

ڕێگای دووەم : میراتەکە دابەش بکە بە سەر مەسئەلەکەدا وە کەڕەتی بکە ئەوەی دەرچوو لە تیر وە هەموو یەکێ لە میرات لەبەر پەیدا دەبێ بەشەکەی :

| ژن | دایك | مام | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٤ | ١/٣ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |

لەم نمونەدا سەدەکە دابەش دەکەی بە سەر مەسئەلەکەدا کە دوانزەیە ، (١٠٠÷١٢= ٨ ١/٣ ) ، لە پاشا کەڕەتی بکە (١/٦ ٨ ) لە سێ ی ژنەکە ، وە چواری دایك و پێنجی مام پەیدا دەبێت بۆ هەموو یەکێك لەوانەی باسمان کرد :

٨ ١/٣ ×٣= ٢٥ دینار بەشی ژن .

٨ ١/٣ ×٤= ٣٢ ١/٣ دینار بەشی دایك .

٨ ١/٣ ×٥= ٤١ ١/٣ دینار بەشی مام .

ڕێگای سێهەم : نیسبەت دەدرێ تیری هەموو میرات بەرێ لە مەسەلەکە بۆ لای ، وەری دەگرێ لە میرات بە گوێرەی ئەو نیسبەتە ، ئەوەی وەرگیراوە بەشەکەیەتی ، سێ ی ژنەکە بۆ ئەم مەسەلە چوار یەکە ، وەری بگرە بۆی چوار یەکی میراتەکە کە بیست و پێنجە ، وە چواری دایك لەم مەسەلەدا کە سێ یەکی میراتەکەیە ، بۆ دایك هەیە سێ یەکی سەدەکە کە سی و سێ دینار و سێ یەکی دینارێکە ، وە پێنجی مام چوار یەك و شەش یەکە بۆی هەیە چوار یەکی سە دینارەکە کە بیست و پێنج دینارە وە شەش یەك کە شانزە دینار و سێ یەکی دینارێکە کە دەکاتە (٢/٣ ٤١ دیناری .

## باب الخنثى المشكل

## میراتی نێر و مێی سەر لێ دەرنەچوو

پێویست بوو بۆ ئەو کەسەی تەرجەمەی دانابوو بۆی بیویتایە : ( بابی میراتی نێر و مێی سەر لێ دەرنەچوو سکی ژن ( حمل ) و وون بوو ( مفقود ) ە .

وە رەحەبی هەردووکیان لەگەڵ نێر و مێی سەر لێ دەرنەچوو باس کردووە یا هەموو یەکێ بە تاك باس بکردایە هەموو مەسئەلەیەك لەم سێ مەسائیلانە بە باسێك :

نێر و مێی سەر لێ دەرنەچوو دوو جۆرە :

یەکەم : ئەوەی ئالەتی پیاو و ژنی هەبێ .

دووەم : ئەوەیە کونێکی ببێ و میزی لێ دەربچێ نە لە عەوردتی پیاو بچێ وە نە لە عەورەتی ژن ، ئەم جۆرە پێی دەڵێن نێر و مێی سەر لێ دەرنەچوو (مشکل) روون نابێتەوە تا منداڵ بێ ، ئەگەر باڵغ بوو دەگونجێ روون ببێتەوە .

وە جۆری یەکەم کەم جارێ روون دەبێتەوە با منداڵیش بێ ، وە بۆ سەر دەرنەچوو یان و روونیان چەند نیشانە هەیە لە میز و ئارەزوو جگە ئەمانەش وە جێگای باسکردنی ئەمە ، وە دەرێژەی لە کتێبە شەرعییەکاندایە ، مەبەست لەیرەدا چۆنییەتی میرات بردنی نێر و مێی سەر لێ دەرنەچوو وە میراتی ئەو کەسەی کە لە گەڵیەتی لە میراتبەر لە کاتی سەر لێ دەرنەچوونەکەی .

نێرومێ تا بە سەر دەرنەچوو مابێتەوە قابیل نییە ببێت بە مێرد یان ژن لە بەر ئەوە دروست نییە نیکاحی ، وە نابێ بە باوك و دایك و باپیر و نەنك ، لە بەر ئەوەی ئەگەر یەکێکیان بێ ئەوە روونە ، وە ئەوەی دانراوە

نێرومێـی سـەر لێ دەرنەچـووە وە حوکمەکـەی روون و ئاشـکرایە لـەوەی رابورد .

**وان يكـن في مستحـق المال      خنـثى صحيـح بين الإشـكال**

ئەگەر بوو لە ناو ئەوانەی شایستەی میرات بوون لە میرات بەر – نێر و مێی سەر لێ دەرنەچووی راست و ئاشکرا بوو سەر لێ دەرنەچوونەکەی .

**فاقسم على الأقل واليقيـن      تحظ بحق القسـمة والمُبين**

دابەشی بکە میراتەکە لە نێوان میرات بەر و نێر و مێی لە سـەر کـەمترین بەش و یەقین بۆ هەموو میراتبەر – دابەشێکی راستت کردووە .

ئەگەر کەسێك مرد لە دوای بە جێما میراتبەر وە تیانابوو نێرومێی سەر لێدەرنەچوو کاردەکرێ لە گەڵ نێرومێ و ئەوەی لە گەڵیەتی لـە میراتبـەر بـە شێوەیە کە زیانی ببـێ لـە نێری نێـر و مـێ کـەو مێیەکەی ، وە دەردرێ بـە هـەموو یـەکێ لـە میرات بـەران بـە یـەقین ، وە دەوەسـێنرێ ماوەکە تـا روون دەبێتەوە حاڵی نێرومێ کە وەکار دەکرێ بە گـوێرەی نێـر و مـێ کە وەکـار دەکرێ بە گوێرەی روونبوونەوە یا رێك کەوتن لە نێوان خۆیانا .

ئەگەر پیاوێك مرد لە کوڕ و ئەولادێکی نێرومێی سەر لێ دەرنەچوو : بە دانانی لـە مەسـەلەکەدا بـە نێر ئەوە ماڵە کـە لـە نێـوان ئـەو کوڕەکە دابـەش دەکرێ بە یـەکسانی :

| کوڕ | نێرومێ (نێر) | مسئلە |
|---|---|---|
| ١ | ١ | ٢ |

وە بـە دانـانی بـە مـێ بـۆ نێرومـێ سـێ یـەکی ماڵەکـەی بـۆ هەیـە ، وە کوڕەکە دووسێ یەکی بۆ هەیە :

| کوڕ | نێرومێ (مێ) | مسئلە |
|---|---|---|
| ٢ | ١ | ٣ |

بەڵام دادەنرێ نێرومێ ی سەر لێ دەر نەچوو کە لە ئاستی خۆیا بە مێ ، وە سێ یەکی ماڵەکە وەردەگرێ ، وە داش دەنرێ بە نێر لە ئاستی کوڕەکە ، کوڕەکە نیوەی ماڵەکە وەردەگرێ ، وە شەش یەکی ماڵەکە کە ماوە دەوەستێنرێ لە نێوانیانا تا نێرومێ کە حاڵی روون دەبێتەوە یا رێك دەکەون :

| کوڕ | نێرومێ | مسئلە |
|---|---|---|
| ٣ | ٢ | ٦ |

کوڕەکە سێ وەردەگرێ چونکە نیوەی شەشە وە نێرومێکە کە دوو وەردەگرێ ، وە یەکێکیش دەمێنێتەوە کە شەش یەك دەکات لە نێوانیانا تا حاڵی ئاشکرا دەبێ یا رێك دەکەون .

زانرا لە کاتی تێگەیشتن لە فەرموودەی رەحەی ئەگەر جیاوازی نەبوو بەشی نێرومێکە یا نەگۆڕێ بەشی ئەو میراتبەرەی لە گەڵیایەتی دەدرێ پێی بەشەکەی بە تەواوی لە بەر ئەوەی ئەوە کەمترین بەشێکە بە یەقین .

ئەگەر پیاوێك بمرێ لە برایەکی دایك و باوکی ، (برا یا خوشکی دایکی ) نێرومێی سەر لێ دەرنەچوو ، ئەو نێر و مێیە بەشەکەی نێربێ یان مێ ناگۆڕێ هەرشەش یەك وەردەگرێ وە بۆ براکەش ماوەیە :

| برا یاخوشکی دایکی (نێرومێ) | برا | مسئلە |
|---|---|---|
| ١/٦ | ماوە | ٦ |
| ١ | ٥ | |

وە ئەگەر پیاوێك مرد لە کچ و وەلەدێکی باوك و دایکی یا باوکی نێرومێ ی سەر لێ دەرنەچوو :

| کچ | برا یاخوشکی دایکی (نێرومێ) | مسئلە |
|---|---|---|
| ١/٢ | ماوە | ٢ |
| ١ | ١ | |

بۆ كچەكەیە نیوە بە دانان ، وە بۆ نێرومێكە یە ماوە بە تەعصیب لە بەر ئەوەی یا (عصبە بنفسە) یە یا ( عصبە مع الغیر) ە .

ئەگەر پیاوێك مرد لە ژنێك و دایك و ئەولادێكی نێرومیٚ و كوڕێك :

| ژن | دایك | كوڕونێرومیٚ یە | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٨ | ١/٦ | ماوە | ٣×٢٤ |
| | | | ٧٢ |
| ٣ | ٤ | ١٧ | |
| ٩ | ١٢ | ٥١ | |

بۆ ژنەكە هەشت یەك ، وە بۆ دایك شەش یەك لە بەر ئەوەی بەشی هەردووكیان ناگۆڕیٚ بە هۆی نێری یان مێی سەر لیٚ دەرنەچووەكە ، وە بۆ نێرومێكە سیٚ یەكی ماوەی بۆ هەیە كە حەڤدەیە ، وە بۆ كوڕەكە نیوەی ماوەی بۆ هەیە كە بیست و پێنج و نیو دەكات ، وە شەش یەكی ماوە دەوەستێنرێت لە نێوانیاندا كە (٧,٥ ) دەكات .

مەسەلەی بە نێر دانانی نێرومیٚ كە راست دەبێتەوە مەسەلەكە لە چل و هەشت :

| ژن | دایك | كوڕونێرومیٚ یە | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٨ | ١/٦ | ماوە | ٢×٢٤ |
| | | | ٤٨ |
| ٣ | ٤ | ١٧ | |
| ٦ | ٨ | ٢٤ | |

وە مەسەلەی بە میٚ دانانی نێرومێكە راست دەبێتەوە مەسەلەكە لە حەفتاو دوو :

| ژن | دایك | كوڕونێرومیٚ یە | مسئلە |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٨ | ١/٦ | ماوە | ٣×٢٤ |
| | | | ٧٢ |
| ٣ | ٤ | ١٧ | |
| ٩ | ١٢ | ٥١ | |

وەکۆ کردنەوە لە نێوانیاندا مەسەلەکە راست دەبێتەوە لە سەدوچل چوار :

| ژن | دایك | کوڕ ونێرومێ یە | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١ | ١ | ماوە | ٣×٢٤ |
| ٨ | ٦ | | ٢× ٧٢ |
| ٣ | ٤ | ١٧ | ١٤٤ |
| ٩ | ١٢ | ٥١ | |
| ١٨ | ٢٤ | ٥١ ١٠٢ | ٣٤ |

بۆ ژنەکە هەژدە ، وە بۆ دایك بیست و چوار ، وە بۆ نێرومێکە بە دانانی بە مێ سی و چوار ، وە بۆ کوڕەکە پەنجاو یەك ، وە بە دانانی نێرومێکە بە نێر بەرامبەر بە کوڕەکە بۆیە پەنجاو یەك وەردەگرێ کوڕەکە ، وە ئەوەی وەسێنراوە لە نێوانیانا حەڤدەیە .

وەرگیراوە لە فەرمووەدەی رەحەبی دووبارە ئەگەر نێرومێ یا غەیری ئەو لە میرات بەر میراتی دەبرد بە دانانی نێرومێ لە حاڵێکا ، وە میراتی نەدەبرد بە دانانی نێرومێ لە حاڵێکی تر ،ئەوە هیچی نادرێتێ .

ئەگەر پیاوێك مرد لە دوای بە جێما نێرومێیەکی سەر لێ دەرنەچوو و مامێ بە دانانی نێرومێ کە بە نێر ئەوە هەموو ماڵەکە بۆ ئەوە و مامەکە هیچی ناکەوێ ، وە بە دانانی نێرومێکە بە مێ ئەوە نیوەی ماڵەکەی بۆ هەیە و ، ئەوەی ماوەتەوە بۆ مامەکە ، نێرمێکە دادەنرێ بە نێر لە ئاستی مامەکەدا ، وە بە مێ دادەنرێ لە ئاستی خۆیدا ، بە نێرومێکە نیوەی ماڵەکەی دەدرێتێ ، نیوەکەی تری دەوەستێنرێ لە نێوان هەردووکیاندا .

ئەگەر ژنێ مرد مێرد و برازایەکی نێرومێ ی سەر لێ دەرنەچوو و مامێکی بوو :

| مێرد | کوڕبرا ونێرومێ | مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١ | ماوە | بێ بەش | ٢ |
| ٢ | | | |
| ١ | ١ | | |

بۆ مێرد نیوه ، وه ماوه بۆ نێرومێ به دانانی به نێر . وه ئەگەر بە مێ دانرا ئەوه هیچی ناکەوێ لە بەر ئەوەی کچی برا بێ بەش دەبێ ، وه ماوه بۆ مامەکە ، هیچ نادرێ بە نێرومێکە وه بە مام دەوەستێنرێ نیوه ماوەکە لە نێوانیاندا : ئەگەر ئاشکرا بوو نێرومێکە نێرە ئەوه هەمووی وەردەگرێ یا مێیە ئەوه مامەکە وەری دەگرێ .

واحكم على المفقود حكم الخنثى إن ذكرا كان هـــو أو أنثى

حوکم بکە بە سەر وون بوو (مفقود) ا حوکمی نێرومێ ی سەر لێ دەرنەچوو – ئەگەر چی نێر بێ یا مێ .

ئەگەر کەسێك مرد هەندێ لە میرات بەر وون بوو ، بەم شێوه لە ولاتا نەمابێ یا دیل بێ وه دیارنەبوونەکەی درێژه بکێشێ ، وه حاڵی نەزانرێ وه نەزانرێ ئایا زیندووه یان مردووه ، حوکم بکە بە سەر وونبوودا بە حوکمەی کە کردت بە سەر نێرومێی سەر لێ دەرنەچوودا ، کە ئەوەیە ماڵەکە دابەش دەکرێ بە سەر ئامادەبواندا لە سەر کەمترین بەشێ بە یەقین ئەمەش وادەبێ ، مردووەکە بە زیندوو دابنرێ وه سەیر بکرێ تێیا وه بە مردووی دابنێ ی و سەیر بکەی تێیا .

هەر میراتبەرێ دەگۆڕا بە هۆی مردن یا ژیانی وونبووەکە بیدە پێی کەمترینی ئەو دوو بەشە .

وه ئەگەر میراتبەرێ نەدەگۆڕا بەشەکەی ئەوه بەشەکەی بە تەواوی دەیدرێتێ ، وه کەسێ میراتی دەبرد بە حاڵێ وه نەیدەبرد بە حاڵێکی تر ، ئەوه هیچی نادرێتێ وه هیچ نادرێ بە میرات بەرانی وون بوو ، لە بەر ئەوەی گومانی ژیانی هەیە ، کارکردن بە یەقین دەکرێ لە هەموویانا .

وه دەوەستێنرێ ئەو ماوه تا ئاشکرا دەبێ حاڵی وون بوو یا قازی حوکم دەکا بە مردنی لە رووی ئیجتیهادەوه .

نمونە : پیاوێك مردووه دوو کوڕی هەیە یەکێکیان وون بووه ، بۆ کوڕه

ئامادەکە نیوەی ماڵەکەی بۆی هەیە لە بەر ئەوەی گومانی ژیانی وونبووەکە هەیە ، وە نیوەی تری دەوستێنرێت .

وە ئەگەر ژنێك مرد : مێرد و دایك و دوو برای دایك و باوکی یا دایکی هەیە ، یەکێکیان وون بوون :

| ژن | دایك | ٢برا دایك و باوکی یەکێکیان وون بووە | | | مسئلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ماوە | | | ٦ |
| ٣ | ١ | ١ | ٢ | ١ | |

| ژن | دایك | ٢برا دایکی یەکێکیان وون بووە | | | مسئلە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٦ | ١/٣ | | | ٦ |
| ٣ | ١ | ١ | ٢ | ١ | |

بۆ مێرد نیوەی تەواو ، وە بۆ برا ئامادەکە شەش یەك . یەکسانە برای باوك و دایکی بێ یا باوکی یا دایکی بێ ، وە لە بەر نەگۆڕانی بەشی مێرد و براکە ، وە بۆ دایك شەش یەك لە بەر گومانی ژیانی وونبووەکە هەیە ، وە دەوەسێنرێت شەش یەکی ماوە ، ئەگەر ئاشکرا بوو وون بووەکە زیندووە ئەوە شەش یەکی ماوە وەسێنراوەکە بۆ ئەوە ، وە ئەگەر مرد بوو ئەوە بۆ دایکەکەیە .

**وهـــكذا حكـــم ذوات الحمـــل ـــــ فـابن علـــى اليقيـــن والأقـــل**

هەروەهایە حوکمی ژنی سك پڕ وەك حوکمی وون بوو وایە — دروستی بکە لە سەر یەقین و کەمترین بەش .

هەروەهایە حوکمی ژنی سك پڕ ، ئەو ژنانەی کە سك پڕ بن ، سکەکانیان حوکمی وون بوونیان هەیە ، دەوەسێنرێت بەشی سکی ژنەکە تا ئاشکرا دەبێ حاڵی سکەکە بە جیابوونەوەی بە زیندوویەتی یا مردوویەتی یا جیانەبوونەوەی ، وە کار دەکرێ لە گەڵ میراتبەرانی تردا بە

زیان گەیاندن لە دانانی نەبوونی سك و بوونی مردن و ژیانی و نێریەتی یا مێیەتی و تاکی و کۆیی ، دەدرێت بە هەموو یەکێك لە میرات بەر بە یەقین ، وە دەوەسێنرێت ماوەکەی تا ئاشکرا دەبیٚ حاڵی سکی ژنەکە .

نمونەیە : پیاوێك مردووە ژنێکی سك پڕی هەیە ، بۆ ژنەکە هەیە چوار یەك بە دانانی نەبوونی سك و جیابوونەوەی بە مردوویەتی .

وە هەشت یەکی بۆ هەیە بە دانانی بە جیابوونەوەی سکەکە بە زیندوویەتی هەرچۆن بیٚ .

وە ماوەکە دەوەستێرێت ، ئەگەر سکەکە ئاشکرا بوو نێرە یا چەند نێرێکە یا چەند نێرومێیەکە ئەوە وەسێنراو بۆ ئەوە یان بۆ هەموویانە ، دابەش دەکریٚ بە سەریاندا ئەگەر هەموو نێر بوون .

وە ئەگەر نێرومیٚ بوون دابەش دەکریٚ بە سەریاندا بە گوێرەی نێر دوو ئەوەندەی مێی بۆ هەیە .

وە ئەگەر ئاشکرا بوو سکەکە کچێکە ئەوە نیوەی بۆ هەیە ، یا دوو کچ یا زیاتر بوو ئەوە دوو سیٚ یەکیان بۆ هەیە ، وە ئەوەی مایەوە بۆ (بیت المال)ە ، ئەگەر رێك و پێك بیٚ کە ئێستا نییە یا دەگەڕێتەوە بە سەریاندا .

وە ئەوە هەمووی بە مەرجی ئەوەی سکەکە منداڵەکە جیاببێتەوە وە ژیانی دامەزراوی تیابیٚ ، ئەگەر ئاشکرا بوو ژنەکە سکی نییە یا مرد بوو یان هەندێکی جیا بووبوویەوە ژیانی تێدا بوو وە مرد پێش ئەوەی بە تەواوی جیا ببێتەوە یان هەمووی جیا بوویەوە زیندوو بوو بەلاّم ژیانێکی دامەزراوی تیا نەبوو ئەوە میرات وەرناگریٚ لە هەموو ئەو وێنانەدا ، بوونی وەك نەبوونی وایە ، چوار یەکی تەواو بۆ ژنەکە ، وە ماوەش لەم مەسەلەدا بۆ بیت المالی رێك و پێك کراوە ئەگەر وانەبوو بۆ (ذو الأرحام ) ە .

ئەگەر پیاوێك مرد : ژنێکی سك پڕ و باوك و دایکی لیٚ بە جیٚ ما بە زیان گەیانێکی زۆر لە مافیان لە بوونی سکەکەدا ژمارەیك لە میٚ بن تا

بەرزبوونەوە بڕواتە سەریان وە بەشەکانیان کەم ببیٚ بە هۆی سکەکەوە ، لـە بەر ئەوە مەسئەلەکەیان بەرزدەبێتـەوە لە بیست وچوار بۆ بیست و حەوت .

| ژن | سك پڕ (دوویازیاتر لە کچ) | دایك | باوك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ٢/٣ | ١/٦ | ١/٦ + ماوە | ٢٤ بەرزبوویەوە بۆ |
| ٣ | ١٦ | ٤ | ٤ | ٢٧ |

بـۆ ژن و دایـك و بـاوك بەشـە بەرزکراوەکـەیان دەدرێتـیٚ ، وە مـاوە دەوەستێنریٚ کە شانزە تیرە تا ئاشکرا بوونی حاڵی سکەکە (حمل) کە .

## باب الغرقى والهدمى والحرقى

## میراتی خنكاو به ئاو و رووخاو و سوتاو

پێویسته بۆ ئەو کەسەی بەش بەشی بکا بڵێ (خنکاو بە ئاو و ئەوەی وەك ئەو بێ ) لە بەر ئەوەی باسی حوکمی خنکاو بە ئاو و خانو رووخان بە سەرا و سوتاو و ئەوەی وەك ئەوانە :

وإن يمت قوم بهدم أو غرق أو حادث عم الجميع كالحرق

ئەگەر مردن میرات بەران لە پیاوان و ژنان و یا بە هۆی خانوو روخان بە سەرا یا خنکان بە ئاو – یا رووداوێ هەموو بگرێتەوە وەك سوتان .

ولم يكن يعلم حال السابق فلا تورث زاهقا من زاهق

وە نەزانرێ کامیان پێشکەوتووە لە مردنا – میرات نابەن هیچکامیان لەوی تریان .

وعدهم كأنهم أجانب فهكذا القول السديد الصائب

وە مردووەکان بگەڕێنە وەك بگانە لە یەك – ئاوایە فەرموودەی راستی پێکاو .

ئەگەر دوو کەس یا چەند کەسێك کە میرات لە یەکتری دەبەن مردن بە جۆرێکی وا ئاشکرا نەبوو کامیان لە پێش ئەویانا گیانی دەرچووە وەکو کۆمەڵێك رووخانی خانوو بە سەریانا یا خنکاندنیان لە ئاوا یا سوتاندنیان یا لە جەنگا بکوژرێن یا لە غەرێبیا بمرن ئەوە هیچ کام لەوانە میرات نابەن لە یەکتر ، ئەوانە وەك بێگانە وانە بە یەك وە ماڵی هەر یەکیان دەگەڕێتەوە بۆ میرات بەرەکانی تری خۆی ، بەڵگەی میرات نەبردنی ئەمانە ئەوەیە مەرجی میرات بەر ئەوەیە میرات بەرەکە لە کاتی مردنی خاوەن میراتەکەدا زیندوو بێ بە حەقیقی یا بە حوکم ، وە ئەو مەرجە دەست ناکەوێ لە حاڵی وادا .

ئەگەر دوو برای باوك و دایكی یا باوكی بمرن بە هۆی خنكاندن لە ئاودا ، یا لە ژێر خانوودا ، وە نەدەزانرا كامیان لە پێش ئەوی تریان گیانی دەرچووە ، وە یەكێكیان ژنێك و كچێكی هەیە ، وە ئەوی تریان دوو كچی هەیە ، وە هەریەكیان مامێكیان هەیە : ئەوە ئەو دووبرا هیچ كامیان لەوی تریان میرات نابەن لە یەكتر .

| ژن | كچ | مام | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٨ | ١/٢ | ماوه | ٨ |
| ١ | ٤ | ٣ | |

| كچ | مام | مسئله |
| --- | --- | --- |
| ٢/٣ | ماوه | ٣ |
| ٢ | ١ | |

لە مەسئەلەی یەكەمدا ژنەكە هەشت یەك دەبات و بۆ كچەكە نیو و بۆ مام ماوە .

وە لە مەسئەلەی دووەمدا دوو كچەكە دوو سیٚ یەك و مامەكە ماوە وەردەگریٚ .

مەسئەلەیە : ژن و مێرد و سیٚ كوری هەردووكیان ، هەموویان بە یەكەوە خنكاون لە ئاوا یان مردن بە یەكەوە ، وە نەدەزانرا كامیان لە پێشەوە گیانی دەرچووە ، وە هەموو یەكێكیان ماڵیان بە جیٚ هێشتووە ، ، مێردە خنكاوەكە ژنێكی تر و كوڕێكی هەیە ، وە ژنە خنكاوەكە كوڕێكی تری هەیە لە پیاوێكی تر ، هەریەكە لەو ژنە خنكاو و مێردە خنكاوە میرات لە یەك نابەن ، وە هەروەها میرات نابات ئەو سیٚ كوڕە لەدوو براكە بەڵكو ماڵی مێردە خنكاوەكە هەشت یەكی بۆ ژنە زیندووەكەی ، وە ماوەش بۆ كوڕەكەی :

| ژن | كوڕ | مسئله |
| --- | --- | --- |
| ١/٨ | ماوه | ٨ |
| ١ | ٧ | |

وه ماڵی ژنه خنكاوەكه بۆ كوڕەكەی كه له مێردێكی تر بویەتی :

| كوڕ | مسئله |
| --- | --- |
| ١ | ١ |

وه ماڵی هەموو یەكێك لەوسێ كوڕه خنكاوانه شەش یەكی بۆ برا داكییەكەیان واته : كوڕی ژنه خنكاوەكەیه له مێرده خنكاوەكەی نییه .

ماڵی سێ كوڕەكه بۆ

| برای دایكی | برای باوكی | مسئله |
| --- | --- | --- |
| ١/٦ | ماوه | ٦ |
| ١ | ٥ | |

وه فەرموودەی ((**ولم يكن يعلم حال الســـابق** )) نەزانرێ كامیان پێش كەوتووه له هەندێ نوسخەدا هاتووه ((**ولم يكن يعلم عين الســـابق** )) .

لەم باسه دەرچووه ئەگەر زانرا كێ پێش كەوتووه ئەگەر بەدەوام بوو زانینەكەی یا له بیری چوویەوه میرات دەبات كەسێ كه له دوایەوه مردبێ له هەردوو وێنەكەدا دەدرێت به میرات بەرانی كەسێ له دوایەوه مردبێ بەشی میرابەرانی پێشكەوتوو له مردندا له وێنەی یەكەمدا دەوەسێنرێ هەموو ماڵەكه له وێنەی دووەمدا تا یادیان دەكەوێتەوه كێ له پێشەوه مردووه .

وه فەرموودەی (قوم) پیاوان و ژنان دەگرێتەوه ئەوه ناوێكی كۆیه و تاكی نییه له وشەی خۆی ، وه (قوم) له ئەصڵدا پیاوان دەگرێتەوه نەك ژنان وایان وتووه كۆمەڵێ له بەر فەرموودەی خودا ﴿لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ﴾الحجرات/١١ ، واته : با كۆمەڵێ له پیاوان گاڵته نەكەن به پیاون ، لەوانەیه كه گاڵته پێكراوەكان له گاڵته كەران باشتر بن ، وه با كۆمەڵێ له ژنان گاڵته به كۆمەڵێ له ژنان نەكەن .

وتەی زوهەیەر :

**وما ادری ولست ادخال ادری اقوم آل حصن ام نساء**

نازانم و گومان نابەم بزانم ئایا ئالی حصن پیاون یا ژنن ..

وتویانە ژنان دەرۆنە ریزی پیاوان لە سەر ڕێگای شوێن کەوتن لە بەر ئەوەی نەتەوەی هەموو پێغەمبەران پیاوان و ژنان وە کۆمەڵێ وتویانە لە ئەهلی زمان (قوم) پیاوان و ژنان دەگرێتەوە ، وە رەحەبی ئەوەی مەبەست بووە ، وە (الهدم) بە سکونی دالەکە کردارەکەیە – خنکاندنەکەیە ، وە بە فەتحەی دالەکە ناوە بۆ خانووە رووخاوەکە ، وە (الزاهق) رۆیشتوو وتراوە (زهقت روحه اذا خرجت ) واتە گیانی دەرچووە .

## امثلة ذكر حلها وتعليلها

## چەند نمونەیە باسكرا بێ راهێنان و هۆكارەكانی

(١) پیاوێك مردووە : براوخوشكێكی باوك و دایكی و ئەولادێكی نێرومێی سەر لێ دەرنەچووی هەیە ، خوشكەكە دەبێت بە عەصەبە بە برا باوك و دایكییەكەی ، وە پلەیان دواترە لە پلەی عەصەبەی كوڕیەتی ، ئەولادی نێرومێی سەر لێ دەرنەچوو ، ئەگەر بە نێر دانرا ئەوە هەموو ماڵەكە وەردەگرێ بە عەصەبە .

وە ئەگەر بە مێ دانرا ئەوە نیوەی ماڵەكە وەردەگرێ لە حاڵی دانانی بە نێر براو خوشكەكە هیچ نابەن و بێ بەش دەبن وە لە حاڵەتی مێیدا خوشك و براكە نیوەی ماڵەكەیان دەكەوێ لە سەر بنچینەی نێر دوو ئەوەندەی مێی دەكەوێ ، وە كار دەكرێ لە گەڵ نێر و مێكە بە خرابترین حاڵی كە نیوەی دەدرێتێ لە بەر ئەوەی ئەوە یەقینە ، وە كار دەكرێ لە گەڵ براو خوشكەكەدا بە خرابترین ماڵین و هیچیان نادرێتێ وە نیوەی ماڵەكە دەوەستێنرێ تا روون دەبێتەوە حاڵی نێرومێكە یا رێك دەكەون .

ئەگەر ئاشكرا بوو نێرومێكە نێریەتی ئەوە ئەو نیوەكەی تر وەردەگرێ وە ئەگەر ئاشكرا بوو نێرومێكە مێیەتی ئەوە نیوەی ماڵەكەی خوشك و براكە وەری دەگرن و دابەشی دەكەن لە نیوانیاندا دوو بەشی بۆ براكە و بەشێ بۆ خوشكەكە :

| ئەولادی نێرومێ (نێر) | براوخوشك | مسئله |
| --- | --- | --- |
| نیوەی دەدرێتێ و ئەو نیوەكەی تر دەوەستێندرێ تا حاڵی نێرومێ كە روون دەبێتەوە | بێ بەش | ١ |
| ١ | | |

| براوخوشك | ئەولادی نێرومێ (نێر) | مسئله |
| --- | --- | --- |
| ماوە | $\frac{١}{٢}$ | ٢ |

(٢) پیاوێك مردووە : كچێك و ئەولادێكی نێرومێی سەر لێ دەرنەچووی هەیە ئەگەر نێرومێكە بە مێ دابنرێ ئەوە وەك ئەوە وایە دوو كچە بە جێ

هێشتبیٚ وه بەشیان دوو سیٚ یەکی میراتەکەیە ، به بەش وه ماوەکەش دەگەڕێتەوه بۆیان ، ئەگەر میرات بەری تر نەبیٚ .

وه ئەگەر نێرومێکە به نێر دابنریٚ ئەوه هەموو ماڵەکە بۆ ئەو خوشکەیەتی به عەصەبه دوو بەشی بۆ ئەو و بەشەکی بۆ خوشکەکەی ، ئەو بەشەی یەقینە بۆ کچکه سیٚ یەکی میراتەکە واتە نێرومێکە به نێر دادەنریٚ لە ئاستیدا وه بەشی نێرومێکە به یەقین سیٚ یەکی میراتەکە وەردەگریٚ وه دەدریٚ به نێرومێکە سیٚ یەکی میراتەکە .

وه دەوەستێنرێت سیٚ یەکی سێهەم –ماوه– تا ئاشکرا دەبیٚ حاڵی نێر ومیٚ یا رێك دەکەون ئەگەر نێرومێکە ئاشکرا بیٚ نیریەتی ئەوه سیٚ یەکی وەستێنراوەکە وەردەگریٚ وه ئەگەر نێرومێکە ئاشکرا بوو مێینەکەی ئەوه سیٚ یەکی وەسێنراوەکە دەگەڕێتەوه بۆ نێرومیٚ و خوشکەکە به یەکسانی لە بەر یەکسانی بەشەکەیان .

(٣) پیاوێك مردووه : باوك و دایك و ئەولادێکی نێرومێی سەر لیٚ دەرنەچووی هەیە : ئەگەر ئەولادە نێرومێکە دابنیٚ به نیر ئەوه باوك و دایکەکە هەریەکێان شەش یەکیان دەکەویٚ ،.وه ماوەی هەموو ماڵەکە دووسیٚ یەکی ماڵەکە دەکات بۆ کوڕەکەیە ، وه ئەگەر وەلەدی نێرومێکە به میٚ دەرچوو بۆ باوکەکە هەیە دوو شەش یەك : شەش یەك به بەش و شەش یەك به تەعصیب واتە شەش یەك و ماوه دەکەویٚ .

وه بۆ دایك شەش یەك ئەوەی یقین بیٚ لە بەشی باوکەکە شەش یەك وەردەگریٚ به بەش وه ئەوەی یەقین لە بەشی ئەولادی نێرومێکە نیوەی دەدرێتیٚ واتە نیوەی بەشەکەی دەدرێتیٚ وه دەوەستێنریٚ شەش یەك تا حاڵی نێرومێکە روون دەبێتەوه یا رێك دەکەون ، ئەگەر ئاشکرا بوو نێرومێکە نێرە ئەوه شەش یەکە وەستێنراوەکە وەر دەگریٚ وه ئەگەر ئاشکرا بوو نێرومێکە مێیە ئەوه شەش یەکەکە باوکەکە وەری دەگریٚ .

(٤) ژنێك مردووه : مێرد و كوڕێك و كوڕێكی تری نێرومێی سەر لێ دەرنەچووی هەیە : بەشی مێردەكە لەم مەسئەلەدا چوار یەكە ، بە هەرحاڵێكدا بێ .

ئەگەر ئەولادە نێرومێكە بە نێر دابنرێ سێ لە سەر چواری ماڵەكە دابەش دەكرێ لە نێوان هەردووكیان بە یەكسانی لە سەر ئەوەی بۆ هەموو یەكێكیان سێ لە سەر هەشتی هەموو ماڵەكە هەیە وە ئەگەر نێرومێكە دابنرێ بە مێ ئەوە سێ لە سەر چواری ماڵەكە لە نێوان ئەو و كوڕەكەدایە لە سەر ئەوەی بۆ كوڕەكە نێو وە بۆ نێر و مێكە چوار یەك ئەوەی یەقین بێ بەشی مێردەكە چوار یەكە دەیدرێتێ وە ئەوەی یەقین بێ بەشی كوڕەكە چوار یەك و هەشت یەكی دەدرێتێ وە ئەوەی یەقین بێ بەشی نێر و مێكە چوار یەكی میراتەكەیە دەیدرێتێ لە پاشا دەوەستێنرێ هەشت یەكی میراتەكە تا روون دەبێتەوە حاڵی نێرومێكە یا رێك دەكەون .

ئەگەر ئاشكرا بوو نێرومێكە نێرە ئەوە هەشت یەكەكە وەردەگرێ وە ئەگەر ئاشكرا بوو هەردووكیان نێرن یان مێن ئەوە ماوە دابەش دەكرێ بە یەكسانی لە نێوانیاندا لە بەر ئەوەی میراتبەری تر نییە .

وە ئەگەر ئاشكرا بوو نێرومێكە مێ بوو ئەوە كوڕەكە هەشت یەكە وەستێنراوەكە وەردەگرێ .

(٥) پیاوێك مردووه : ژنێك و دوو كوڕی نێرومێی سەر لێ دەرنەچووی هەیە : بەشی ژنەكە هەشت یەكە لە هەموو حاڵەكانیدا ئەگەر داتنا ئەو دوو كوڕە نێرومێیە بە مێ ئەوە دوو سێ یەكی ماڵەكەیان بۆ هەیە لە سەر ئەوەی بۆ هەریەكێكیان سێ یەك :

| ژن | ٢كوڕی نێرومێ (مێ بێ) | مسئله |
|---|---|---|
| ١/٨ | ٢/٣ | ٢٤ |
| ٣ | ١٦ | |

ئەگەر داتنا کە هەردوکیان نێرن ئەوە هەموو ماوە لە دوای بەشی ژنەکە بۆ هەردوو کیانە بەیەکسانی دەبێ بۆ هەردووکیان( ٧/١٦ ) :

| ژن | ٢کوڕی | مسئله |
| --- | --- | --- |
| ١ | ماوە | ٢×٨ |
| ٨ | | ١٦ |
| ٢ | ١٤ | |

وە ئەگەر داتنا یەکێکیان نێرو ئەوی تریان مێ ئەوە هەموو ماڵەکەیان بۆ هەیە لە دوای بەشی ژنەکە بۆ مێیەکان ( ٧/٢٤ ) لە میرات وە بۆ ئەوەی بە نێرت داناوە ( ١٤/٢٤ ) لە هەموو میراتەکە :

| ژن | ٢کوڕی | مسئله |
| --- | --- | --- |
| ١ | ماوە | ٣×٨ |
| ٨ | | ٢٤ |
| ١ | ٧ | |
| ٢ | ١٤ | |

ئەوەی یەقین بێت بەشی ژنەکە هەشت یەکە دەیدرێتێ ، وە ئەوەی یەقین بێ بەشی هەردووکیان لەو دوو نێرومێیە ( ٧/٢٤ ) ی مەسئەلەکەیە دەیدرێتێ .

وە ماوەکە لە میراتەکەدا دەوەستێنرێ ( ٧/٢٤ ) تا روون دەبێتەوە حاڵیان یا رێك دەکەون ، وە ئەگەر ئاشکرا بوو یەکێکیان نێرە و ئەوی تریان مێیە ، ئەوەی ئاشکرا بوو کە نێرە ئەوە هەموو ماوەکە وەردگرێ ، وە ئەگەر ئاشکرا بوو هەردوو کیان نێر بن یا هەردووکیان مێ بن ئەوە ماوەکە دابەش دەکرێ بە یەکسانی .

(٦) پیاوێك مردووه : ژنێکی سك پڕو کوڕێکی مامی دایك و باوکی هەیە :

بەشی ژنەکە لەم مەسئەلەدا هەشت یەکە هەر چۆن سکەکە دابنرێ ئەگەر دامانـنا سکەکە کوڕە ئەوە هەموو ماڵەکە وەردەگرێ لە دوای بەشی دایکەکە ئەویش ($\frac{٧}{٨}$) ی میراتەکەیە ، وە کوڕی مام بێ بەش دەبێ :

| ژن | سك پڕ (حمل) نێرومێ | کوڕی مام | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| $\frac{١}{٨}$ | ماوە | بێ بەش | ٨ |
| ١ | ٧ | | |

وە ئەگەر دامانـنا کچە ئەوە نیوە وەردەگرێ وە کوڕی مامەکەش ماوە وەردەگرێ کە ($\frac{٧}{٨}$) ی ماڵەکەیە ، ئەوەی بە یەقین بێ بەشی ژنەکە هەشت یەکە دەیدرێتێ . وە کوڕی مامەکە لە سەر یەکێك لە دوو بەشەکەی هیچ وەرناگرێ لە سەر ئەم بنچینە دەوەستێنرێ ($\frac{٧}{٨}$) حەوت لە سەر هەشتی میرات تا ژنەکە سکەکەی دادەنێ .

ئەگەر ژنەکە کوڕی بوو ئەوە ئەوەی وەسێنراوە هەمووی وەردەگرێ ، ئەگەر دوو کوڕ بوون یا هەموویان نێر بوون دابەش دەکرێ لە نێوانیاندا ، وە ئەگەر دوو مێ یا زیاتری بوو ئەوە دوو سێ یەکیان دەدرێتێ ، وە ماوە دەدرێت بە کوڕی مامەکە وە ئەگەر نێر و مێ بوون ئەوە دابەش دەکرێ لە نێوانیاندا بە گوێرەی کوڕ دوو ئەوەندەی کچ .

## تمرينات يطلب حلها

## چەند راهێنانێ داواكراوە راهێنانەكەی

راهێنانی یەكەم : روونی بكەرەوە بەشی هەموو یەكێ: لە میراتبەران لەو بەشانەی دێت ئەگەر بەشی هەندێ لە میراتبەر لە سەر هەندی دانان روونی بكەرەوە بەشەكەی لە سەر هەموو دانانێ روونی كەرەوە ئەوەی دەرواتە سەری لە جیاوازی :

یەكەم : ژنێك مردووە : مێرد و دایك و خوشكێك وبرای یەكی نێرومێی هەیە ؟

| مێرد | دایك | خوشك وبرا(نێرومێ) | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١ | ١ | ماوە | ٣×٦ |
| ٨ | ٦ | | ١٨ |
| ٣ | ١ | ٢ | |
| ٩ | ٣ | ٢ ٦ ٤ | |

ئەوەی یەقین بێت لە بەشی مێردەكە نیوەی دەدرێتێ ، وە هەروەهابەشی دایكەكە شەش یەكی دەدرێتێ ، وە بەشی خوشكەكە دوو تیرە دەیدرێتێ ، وە بەشی نێرومێكە دوو تیرە دەیدرێتێ لە پاشا دەوەستێنرێت دوو تیر تاوەكو روون دەبێتەوە حالّی نێرومێكە یا رێك دەكەون ، ئەگەر ئاشكرا بوو نێرومێكە مێیە ئەوا دابەش دەكرێ لە نیوان هەردووكیاندا بە یەكسانی ،. وە ئەگەر ئاشكرا بوو نێرومێكە نێرە ئەوە دوو تیرە وەستێنراوەكە وەردەگرێ بۆ خۆی .

دووەم : پیاوێك مردووە : دوو كچ و ئەولادێكی نێرومێی هەیە ؟

| ٢كچ | ئەولادی نێرومێ | مسئلە |
|---|---|---|
| | ماوە | ٤ |
| ٢ | ٤ ١ | |

ئەوەی یەقین بێت لە بەشی دوو کچەکە نیوەی میراتەکەیە کە دووە وە هەروەها لە بەشی نێرومێکە چوار یەکی میراتەکەیە . وە دەوەستێنرێ چوار یەکی میراتەکە تا روون دەبێتەوە حاڵی نێرومێکە یا رێك دەکەون ئەگەر ئاشکرا بوو نێرومێکە نێرە ئەوا چواریەکەکە وەردەگرێ .

وە ئەگەر ئاشنکرا بوو نێرومێکە مێیە ئەوە دابەش دەکرێ چوار یەکە وەستێنراوەکە لە نێوان هەرسێکیاندا بە یەکسانی .

سێهەم :پیاوێك مردووە : ژنێك سك پڕ و برایەکی دایك و باوکی هەیە :

| ژن | سك پڕ (حمل) نێر | برا | مسئله |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٨}$ | ماوە | بێ بەش | ٨ |
| ١ | ٧ | | |

ئەوەی یەقین بێت لە بەشی ژنەکە هەشت یەکە دەیدرێتی ، وە براکە لە سەر یەکێك لە دوو بەشی هیچ وەرناگرێ وە دەوەستێنرێ ($\frac{٧}{٨}$) حەوت لە سەر هەشتی میراتەکە سکەکەی دادەنێ ئەگەر ئاشکرا بوو سکەکە نێرە ئەوە حەوت تیرەکە وەردەگرێ . وە ئەگەر ئاشکرا بوو سکەکەی مێیە ئەوە نیوەی دەدرێتی کە چوار لە سەر هەشتی میراتەکەیە ($\frac{٤}{٨}$) وە بۆ براکە ماوە وەردەگرێ کە سێ تیرە :

| ژن | سك پڕ (حمل) مێ | برا | مسئله |
|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٨}$ | $\frac{١}{٢}$ | ماوە | ٣×٣<br>٩ |
| ١ | ٤ | ٣ | |

چوارەم : پیاوێك مردووە : دوو وەلدی نێرومێی و سێ برای دایك و باوکی هەیە ، وەلاّم لە سەر ئەوەی دوو نێرومێکە مێ بن ئەوە دووسێ یەك وەردەگرن ، وە ماوەش بۆ سێ براکەیە : نمونە وەکو :

| ٢ کوڕنێرومێ( مێ ) | ٣برا | مسئله |
|---|---|---|
| $\frac{٢}{٣}$ | ماوه | ٣×٣ |
| | | ٩ |
| ٢ | ١ | |
| ٦ | ٣ | |

وەلاّم لەسەر ئەوەی دوو نێرومێکە نێر بن یان یەکێکیان ئەوە هەموو ماڵەکە وەردەگرن باراکان بێ بەش دەبن :

| ٢وەلدی نێرومێ نێر بن یان یەکێکیان | ٣برا | مسئله |
|---|---|---|
| ٢ بۆ نێر دوو ئەوەندەی مێ | بێ بەش | ٢ |

بۆ نێر دووئەوەندەی مێیە ئەگەر هەردووکیان نێر بن ، مەسئەلەکە لە دووە ئەگەر یەکێکیان نێر بوو ئەوەی تریان مێ ئەوە لە سەر سێ یە ، یەك تیر بۆ مێ و دوو تیر بۆ نێر .

وە بەشی براکان لە سەر یەکێك لەو دوو دانانە هیچ وەر ناگرن مەسئەلەکە دەوەستێنرێ تا حاڵی دوو نێرومێکە روون دەبێتەوە ئەگەر ئاشکرا بوو هەردوو کیان یا یەکێکیان نێرە ئەوە میراتەکە بۆ هەردووکیانە بۆ نێر دوو ئەوندەی مێیە .

وە ئەگەر هەردووکیان مێ بوون ئەوە دوو سێ یەك بۆ دوو کچەکە و ماوەش بۆ سێ براکە .

پێنجەم : پیاوێك مردووە " ژنێك و کچێك و ژنی برا باوك و دایکیەتی هەیە سکی پڕە :

| ژن | کچ | برا ژن | (حمل) نێر (برازا) | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{١}{٨}$ | $\frac{١}{٢}$ | | ماوه | ٢٤ |
| ٣ | ١٢ | | ٩ | |

ئەوەی یەقین بێ لە بەشی ژنەکە هەشت یەکە دەیدرێتێ کە (٣) ، وە بەشی کچکە نیوە دەیدرێتێ کە (١٢) ەیە ، وە ئەوەی تر دەوەستێنرێ تا منداڵەکە دەبێت ئەگەر نێر بوو ئەوە دەێدرێتێ کە (٩) ە ، وە ئەگەر مێ بوو ئەوە هیچ وەرناگرێ و ئەوەی وەستێنراوە دەگەڕێتەوە بۆ کچکە کە (٩) یە بەشەکەی دەکاتە (٢١) لە مەسئەلەکەدا .

| ژن | کچ | برا ژن (حمل) مێ (برازا) | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | ١/٢ +ماوە | بێ بەش | ٨ |
| ٨ | | | |
| ١ | ٧=٣+٤ | | |

شەشەم : ژنێک مردووە مێرد و خوشکێکی باوکی و دایکی و باوەژنێکی سك پڕی هەیە :

ئەوەی یەقین بێ لە بەشی مێردەکە نیوە دەیدرێتێ وە بەشی خوشکەکە نیوە دەیدرێتێ وە ئەوەی مایەوە دەوەستێنرێ : ئەگەر سکەکەی مێ بوو یەکێك یان زیاتر بوو شەش یەك وەر دەگرێ :

| مێرد | خوشکی باوکی و دایکی | باوەژنێکی سك پڕ (مێ بێ یەکێك یا زیاتر ) خوشکی باوکی | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٢ | ١/٢ | ١/٦ شەش یەك وەردەگرێ لە کاتی بوونی خوشکێکی دایك و باوکیدا . | ٦ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ٣ | ١ | ٧ |

وە ئەگەر ئەو سکەی نێر بێ یەکێك یا زیاتر مێ ی لە گەڵ بێ یا نا ماوە بەشیانە ئەگەر بمێننەوە :

| مێرد | خوشکی باوکی و دایکی | باوەژنێکی سك پڕ (مێ بێ یەکێك یا زیاتر ) برای باوکی | مسئله |
| --- | --- | --- | --- |
| ١/٢ | ١/٢ | ماوە هیچ نەمایەوە بۆیان | ٢ |
| ١ | ١ | | |

حەوتەم : پیاوێك مردووە ژنێكی سك پڕ و باوك و دایكی هەیە :

| ژن | سك پڕ ( حمل ) نێربێ | باوك | دایك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ماوە | ١/٦ | ١/٦ | ٢٤ |
| ٣ | ١٣ | ٤ | ٤ | |

ئەوەی یەقین بێ لە بەشی ژنەكە هەشت یەكە دەیدرێتێ . وە ئەوەی یەقین بێ لە بەشی باوك و دایكە دوو شەش یەكە دەیاندرێتێ ، ئەوەی ماوەتەوە كە نیوەی میراتەكە و(١/٢٤) ی میراتەكەیە دەوەستێنرێت تا سكەكە پەیدا دەبێت . ئەگەر ئاشكرا بوو سكەكە نێرە ئەوە هەمووی وەردەگرێ ، وە ئەگەر ئاشكرا بوو مێیە ئەوە نیوە وەردەگرێ كە (١٢/٢٤) ی میراتە وە (١/٢٤) ی میراتەكە باوكەكە وەری دەگرێ لە بەر ئەوەی ئەگەر فەرعی میراتبەر مێ بوو باوك شەش یەك و ماوە وەردەگرێ .

وە ئەگەر سكەكە دوو كچ بوون ئەوە دوو سێ یەك وەردەگرن و مەسئەلەكە بەرزدەبێتەوە بۆ بیست و حەوت :

| ژن | سك پڕ (حمل) مێ بێ | باوك | دایك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ١/٢ | ١/٦ + ماوە | ١/٦ | ٢٤ |
| ٣ | ١٢ | ٤+١=٥ | ٤ | |

| ژن | سك پڕ (حمل) ٢كچ بێ | باوك | دایك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| ١/٨ | ٢/٣ | ١/٦ | ١/٦ | ٢٤ بەرزدەبێتەوە بۆ |
| ٣ | ١٦ | ٤ | ٤ | ٢٧ |

هەشتەم : پیاوێك مردووە : ژنێك و دایك و کوڕی مامی باوك و دایکی هەیە :

| ژن | دایك | کوڕی مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{3}$ | ماوە | ١٢ |
| ٣ | ٤ | ٥ | |

راهێنانی دووەم : کۆشش بکە کە وەڵام بدەیتەوە لە سەر هەموو یەکێك لەو مەسئەلانەی لەغەزەمەتەلانەی دێت بە روون کردنەوە چ ژنێکە ئەو ژنەی سە دەکا بەوەی باسی دەکەین ؟ کێیە ئەو میراتبەرانەی لە میراتەکا ئەو ژنەی دەیەوێ سکەکەی بخاتە ناو میراتبەران ؟

(١) ژنێك کۆمەڵێکی بینی میراتیان دابەش دەکرد ، وتی پێیان پەلە مەکەن لە دابەش کردنی ئەو میراتەدا ، من سك پڕم ، ئەگەر کوڕم بێ میرات وەردەگرێ لەم میراتە ، وە ئەگەر کچم بێ هیچ نابا ؟ وە ئەگەر کوڕوکچم بێ کوڕەکە میرات دەبا و کچەکە نایبا :

نمونەکەی : پیاوێك مردووە : ژنێك و کچێك و ژنێکی مامی باوك و دایکی سك پڕی هەیە : ئەگەر سکەکە کوڕ بێ ئەوە ماوە وەردەگرێ وە ئەگەر کچ بوو ئەوە هیچ وەرناگرێ ؟

| ژن | کچ | ژنێکی مامی باوك و دایکی (سك پڕ) نێربێ | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | $\frac{1}{2}$ | ماوە | ٨ |
| ١ | ٤ | ٣ | |

(٢) ژنێك کۆمەڵێکی بینی میراتیان دابەش دەکرد وتی پیان : من سکم هەیە ئەگەر کوڕم بوو میرات نابا ، وە ئەگەر کچم بوو میرات دەبا :

ژنێك مردووە مێرد و خوشکێکی باوك و دایکی و باوەژنێکی سك پڕی بە جێ هێشتووە ؟

| مێرد | خوشکی باوك و دایکی | باوەژن (سك پڕ) نێربێ | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٢ | ماوە | ٦ |
| | | هیچ نەمایەوە بۆی | |
| ٣ | ٣ | | |

ئەگەر مێ بێ :

| مێرد | کچ | ژنێکی مامی باوك و دایکی (سك پڕ) مێ بێ | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٢ | ١/٢ | ١/٦ | ٦ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ٣ | ١ | ٧ |

(٣) ژنێك کۆمەڵێکی بینی میراتیان دابەش دەکرد وتی پیان : من سکم هەیە ئەگەر کوڕم بوو هەردووکمان میرات وەردەگرین ، وە ئەگەر کچم بوو ئەوە میرات وەرناگرین :

وەکو : کوڕی کوڕی پیاوێك کچی کوڕێکی تری ئەو پیاوە نیکاح دەکات ، ئەو پیاوە بمرێ لەو کچە کە شووی کردووە و سکی پڕە و دوو کچی خۆیشی هەیە :

| ٢کچ | | کچی کوڕی پیاوەکە (سك پڕ) نێربێ | | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| ٢/٣ | | ماوە | | ٣×٣ |
| | | | | ٩ |
| ٢ | | ١ | | |
| ٦ | ١ | ٣ | ٢ | |

ئەگەر مێ بوو :

| ٢کچ | کچی کوڕی پیاوەکە (سك پڕ) مێ بێ | مسئلە |
|---|---|---|
| ٢/٣ | بێ بەشن چونکە نابن بە عەصەبە | ٣ |
| ٢ | | |

(٤) ژنێك کۆمەڵێکی بینی میراتیان دابەش دەکرد وتی پێیان : من سکم هەیە ئەگەر کوڕم بوو هەشت یەك بۆ منە و ماوەش بۆ کوڕەکەیە ، وە ئەگەر کچم بوو ئەوە ماڵەکە لە نێوان من و ئەودایە ، ئەگەر لە بارم چوو ئەوە هەموو ماڵەکە بۆ منە :

ئەوە ژنێك ئازادکارە کە مێردەکەی لە کۆندا بەندەی ئەو ژنە بووە لە پاشا شووی پێ کردووە ، وە سکی بووە لێی وە مێردەکەی مردووە ، و ژنەکەی سکی پڕ بووە پێیەوە ئەگەر کوڕی بوو ئەوە ژنەکە هەشت یەك دەبات و ماوەش بۆ کوڕەکەیەتی ، وە ئەگەر کچی بێ ژنەکە هەشت یەك دەبات و ماوەش لە پاش نیوەی کچەکە :

| ژن | کچ | ژنی ئازادکار | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ١/٨ | ١/٢ | ماوە | ٨ |
| ١ | ٤ | ٣ | |

| ژن | کوڕ | مسئلە |
|---|---|---|
| ١/٨ | ماوە | ٨ |
| ١ | ٧ | |

راهێنانی سێهەم : روونی بکەرەوە میرات بەران و میرات نەبەران لە هەموو مەسئەلەیە لەم مەسئەلانەی دێن ، لە گەڵ روون کردنەوەی بەشی هەموو میرات بەرێ :

ژن و مێردێ خنکاون : پیاوەکە دوو کچ و خوشکێکی باوکی کە خوشکی دایکی ژنەکەیەتی وە کوڕێکی برای دایکی هەیە کە کوڕی مامی ژنەکەیەتی :

نمونەی میراتی مێردەکە :

| ٢کچ | خوشکی باوکی | کوڕی برای دایکی | مسئلە |
|---|---|---|---|
| ٢/٣ | ماوە | بێ بەش | ٣ |
| ٢ | ١ | | |

خوشكی باوكی ماوه وەردەگرێ چونكە مردووەكە فەرعی میرات گری مێینەی هەیە

| خوشكی دایكی | كوڕی مام | مسئله |
|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | ماوه | ٦ |
| ١ | ٥ | |

(٢) دوو برا خنكاون : وه بۆ هەموو یەكێكیان مەولایان هەیە ، هەموو یەكێك لە مەولەلا هەموو ماڵەكە وەردەگرن .

(٣) ژنێك و كوڕێكی خنكاون : برایەك و مێردێكی هەیە كە باوكی كوڕە خنكاوەكەیە :

| مێرد | برا | مسئله |
|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | ماوه | ٢ |
| ١ | ١ | |

| باوك | مسئله |
|---|---|
| هەموو ماڵەكە وەردەگرێ واتە ماڵی كوڕەكە بە تەعصیب | |

(٤) ژن و مێرد و كوڕێكی خنكاون : كوڕەكە ژنێك و كوڕێك و دوو خوشكی باوك و دایكی هەیە :

وه باوكەكە : دوو كچ و باپیر و نەنكی هەیە :وه ژنەكە : نەنكێك و دوو كچ و سێ خوشكی جیاجیای هەیە :

| | ژن | كوڕ | ٢خوشكی باوك و دایكی | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| كوڕەكە لێی بە جێ ماوە | $\frac{1}{8}$ | ماوه | بێ بەش | ٨ |
| | ١ | ٧ | | |

| | ٢كچ | باپیر | نەنك | مسئله |
|---|---|---|---|---|
| باوكەكە لێی بە جێ ماوە | $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | ٦ |
| | ٤ | ١ | ١ | |

مەسئەلەی ژنەكە :

| نەنك | ٢كچ | خوشكی باوك و دایكی | خوشكی باوكی | خوشكی دایكی | مسئلە |
|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | بێ بەش | ٦ بەرز بوویەوە بۆ |
| ١ | ٤ | ٣ | ١ | | ٩ |

(٥) ژنێ: مردووە مێردێكی وون بووە ، دوو خوشكی باوكی ئامادە و مامێكی ئامادەی هەیە :

| مێرد (وونبوو) | ٢خوشك باوك | مام | مسئلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{2}{3}$ | ماوە | ٦ بەرز بوویەوە بۆ |
| ٣ | ٤ | | ٧ |

(٦) پیاوێك مردوو برایەكی باوكی وون بوو برایەكی دایك و باوكی و باپیرێكی ئامادەیی هەیە :

| برا باوكی (وونبوو) | برای باوك و دایكی | باپیر | مسئلە |
|---|---|---|---|
| بێ بەش | ماوە | $\frac{1}{3}$ | ٣ |
| | ٢ | ١ | |

(٧) ژنێك مردووە : برایەكی دایك و باوكی وونبوو ، مێردێ:ی ئامادە و برایەكی باوك و دایكی و دوو خوشكی باوكی ئامادەی هەیە ؟

| مێرد | ٢برا باوك و دایك وون بوو | - | ٢خوشكی باوك و دایكی | مسئلە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | | ماوە | | ٦×٢<br>١٢ |
| ١ | | ١ | | |
| ٦ | ٤ | ٦ | ٢ | |

فالحمــد لله على التمــام | حمــدا كثيــرا تم في الدوام
نأســأله العفو عن التقصيــر | وخيــر ما نــأمل في المصيــر
وغفر ما كان من الذنـــوب | وستــر ما شــان من العيــوب
وأفضل الصـــلاة والتسليـم | على النــبي المصـطفى الكريم
( محمد ) خير الأنام العاقب | وآلــه الغــر ذوي المنـــاقب
وصحبه الأمــاجد الأبــرار | الصفــوة الأكـــابر الأخيــار

سوپاس بۆ خودا لە سەر تەواو کردنی – سوپاسێکی زۆر تەواو بیّ لە هەمیشەییا .

داوای لێ دەکەین لە لێ خۆش بوون لە کەم و کوڕی فەرمانەکانا --
وە داوای لێ دەکەین چاکترین شتێ رجامان وایە لە پاشەرۆژا –
وە داپۆشێ ئەو گوناهانە لە مەوپێش بوون –
وە دای پۆش ئەو گوناهە ناشیرینانە --
بەرێزترین و تەواو ترین سەڵات و سەلام –
لە سەر ئەو پێغەمبەرە بێ کە هەڵبژێرراوە و بەرێزە --
کە محمدە (درودی خودای لە سەر بێت ) چاکترینی خەڵکە کە پێغەمبەر لە دوایەوە نایە .

لە سەر ئال و بەیتی بەشەرفی خاوەنی فەخر و خووی سوپاس کراو --
وە هاورێکانی خاوەنی رێزن چاکن –
بێ گەردن نمونەی هەڵبژێراون

سوپاس بۆ خودای مەزن لێ بوومەوە لە نوسینی ئەم کتێبە پیرۆزە رۆژی شەممە دوای نوێژی عەسر بەرواری ٢٩ ربيع الأول - ١٤٢١ کۆچی و ٢٠٠٠/٧/١ زاینی لە هەڵەبجەی شەهید لە مزگەوتی دار السلام .

# ناوەڕۆك

**وصلى الله على سيدنا محمد وعلى اله و صحبه أجمعين**